# کورد و کوردستان

نووسینی

**ئارشاک سافراستیان**

وەرگێڕانی: ئەمین شوان



ئارشاک سافراستیان

# کورد و کوردستان

ئەمین شوان

لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی

ناوی کتێب: کورد و کوردستان
نووسینی: ئارشاک سافراستیان
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ئەمین شوان
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٤١
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد
هەڵەگری: هەندرێن شێرزاد
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی دووەم، هەولێر - ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٤٠٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ.

## پێشەکی:

کەمال مەزهەر

دەمێ ساڵە «کورد و کوردستان»ەکەی زانای ئەرمەنی دوکتۆر ئارشاک سافراستیان، کە ساڵی ١٩٤٨ لە لەندەن چاپی کردووە، سەرنجی کوردناس و ڕۆژهەڵاتناسانی ڕاکێشاوە و بۆتە یەکێک لەو بەرهەمە مێژووییانەی نووسەران لە نووسینەکانیاندا دەربارەی کورد وەک سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو پەنای دەبەنە بەر، کوردناسێکی وەک پرۆفیسۆر لازەرێڤ جارەهای جار لە نووسینەکانی خۆیدا ئەو کتێبەی بەکارهێناوە. دەمێکە کتێبەکەی سافراستیان سەرنجی ڕووناکبیرە ئینگلیزی زانەکانی کوردیشی ڕاکێشاوە، ساڵی ١٩٦٠ خوالێخۆشبوو مامۆستا عەبدوڵڵا شاڵی بەشێکی کەمی لە نامیلکەیەکی شەست لاپەڕەییدا بەکوردی لێ بڵاو کردەوە[١].

«کورد و کوردستان»ەکەی سافراستیان هەرچەندە بەقەوارە بچووکە (١٠٦ لاپەڕەی مام ناوەندییە) بەڵام بەناوەڕۆک زۆر گەورەیە، ئەو گەورەییەی لە گەلێک ڕووەوە خۆ دەنوێنێ، لە سەروو هەمووشیانەوە دەوڵەمەندی ناوەڕۆکی و بابەتەکیی خاوەنییە. زۆر کەم لە گەڕیدە و مێژوونووسە بیانییەکان وا بەئینسافەوە باسی مێژووی کورد و ژیانی کۆمەڵایەتییان کردووە.

کورد لەم بەرهەمەدا هەمیشە یەکێکە لە نەتەوە هەرە دێرینەکانی ڕۆژهەڵات و سەر زەمین، تەنانەت کاتێک نووسەری دەگاتە سەر باسی مێژووی نوێ و هاوچەرخیش دیسان جاروبار ئەوە دێنێتەوە یادی خوێنەر کە کورد نەتەوەیەکی ڕەسەنە، لە دێر زەمانەوە لەسەر خاکی خۆی دەژی و

---

(١) وەرگێڕ ناوی کتێبەکەی کردۆتە «مێژووی کورد و کوردستان» و لە سلێمانی چاپی کردووە. شایانی باسە مامۆستا عەبدوڵڵا شاڵی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خوێندبووی، ماوەیەکی زۆر لە سلێمانی مامۆستای ئینگلیزی بوو، لە حەفتاکاندا بووە کارگێڕی گشتی خوێندنی کوردی لە وەزارەتی پەروەردە.

مێژووی زنجیرەیەکی نەپساوەی لێک دانەبڕاوە، بۆیەکا ئەو نەتەوەیە هەر ماوە و هەر دەشمێنێ.

دوکتۆر ئارشاک سافراستیان جاری وا هەیە شتی ئەوتۆ دەڵێ کە ئەگەر مێژوونووسێکی کورد بیڵێ لەوانەیە بەلایەنگیری بۆی لێک بدرێتەوە. ئەو تەنانەت هەوڵی داوە پاکانە بۆ ڕەفتارە ناپەسەندەکانی گۆتۆکانیش بکات کە یەکێکن لە سەرچاوەکانی نەوەی کوردی ئیمرۆ، هەرچەندە ئەو جۆرە ڕەفتارانەی ئەوان بۆ ڕۆژگاری ئەوسا کارێکی ئاسایی و باو بوون، پاشایانی سۆمەر و ئەکەد و بابل و ئاشوور، هیچ کامێکیان بۆی لوا بێ و توانیبێتی، لەوان کەمتری نەکردووە، تا بەڵکو هی وایان هەیە (نەبوخوزنەسر و ئاشوور ناسر پاڵی دووەم) هەزار بەردی داوە بەپشتی پاشایانی گۆتو و لۆلۆدا. هەست دەکەیت سافراستیان ئامادەیە دەرۆزگەری بکات تا پتر دەوری ژیاری و شارستانەتی کورد لە ڕۆژهەڵاتی دێریندا برازێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا دانەری «کورد و کوردستان» چاوی لە دەردە کوشندەکانی کۆمەڵگای کورد نەپۆشیوە، بەوردی بۆیان چووە و لێکی داونەتەوە، تایبەت ئەو لاپەڕە شەرمەزارانەی مێژووی نوێ و هاوچەرخی گەلەکەمان کە بەناکۆکی و دووبەرەکی و من منێتی و شەڕی براکوژی نێوان هۆز و تیرە کوردەکان لەسەر هۆی پرو‌پوچ تەنراون، ئەوەی لە دێر زەمانەوە بۆتە تەوقی نەگبەتی لە گەردنی کوردا و قامچی ڕەشە و کوتەکی دەستی دوژمنانی.

سافراستیانی مێژوونووس بۆ دوارۆژی کورد تەواو گەشبینە، ئەو لەوە دڵنیایە کە کورد «لە کەس کەمتر نین» ئەوان «لە دوارۆژدا، بەدڵنیاییەوە دەڵێم، لە بەکارهێنانی فرۆکە و زانستی کیمیادا هەرگیز لە گەلانی تر دواناکەون و کورت ناهێنن» (ل ٩٤ - ٩٥).

دەبوو سافراستیان باسی پێوەندی کورد و ئەرمەن بێنێتە پێشەوە. لەم بوارەشدا وردەکاری زۆرە، زۆر شتی دەگمەنی بۆ تۆمار کردووین کە بۆ خۆی

یا بینیونی، یا لە ناو خودی **کوردستاندا** بیستوونی. ڕاستی بۆ چووە کە دەڵێ عوسمانییەکان بەهەموو جۆر تۆوی دووبەرەکی و ناکۆکییان لە نێوان ئەو دوو نەتەوەیەدا دەوەشاند چونکە دەیانزانی لەگەڵ ئەو هەموو دیاردە سەر زارەکییانەی بەهۆی جیاوازی ئایینەوە، یا بەرژەوەندیی تەسکی ئابوورییەوە هەردووکیان بەڕواڵەت لێک دەترازێن، بەڵام لە ڕاستیدا بەرژەوەندی باڵایان لە یەک سەنگەردا کۆیان دەکاتەوە. بۆیە سافراستیان هیچ بەلایەوە سەیر نییە کە ڕۆڵەکانی هۆزی شکاک و حەیدەران بەنهێنی چەکیان دەگەیاندە شۆڕشگێڕانی ئەرمەن و چۆن شایەرانی کورد بەقەد و باڵایاندا هەڵدەدان (ل ٦٦). ئەوەیش دەڵێ هەر کەسێ پێی وا بێ دەرد و مەینەتی و قاتوقڕی کورد لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا لە هی ئەرمەن کەمتر بوون ئەو کەسە «گەلێک لە ڕاستییەوە دوورە» (ل ٧٤).

جاروبار دوکتۆر ئارشاک سافراستیانیش، وەک هەر مێژوونووسێکی تر، گشت نیشانەکانی بەدروستی نەپێکاوە، «کورد و کوردستان»ەکەی ئەویش بێ هەڵە و کەموکورتی نییە. لە باکور و باکوری ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا وردەگزیی لە کورد کردووە (بڕوانە ل ٧٢ بۆ نموونە)، بەڵام، لەگەڵ ئەوەش، بەر لەوەی کۆتایی بەکتێبەکەی بهێنێ دانی بەوەدا ناوە کە دیاربەکر دەکەوێتە ناوەڕاستی کوردستانەوە و حەق دەداتە «خۆیبوون» کە ئەو شارەی کردووەتە ناو جەرگەی کوردستان (ل ٩٥). لە باسی میدییەکانیشدا سەری کردووە، سەرنجەکانی دەربارەی ئەو گەلە دێرینەی کوردستان زۆر جیاوازن لەگەڵ سەرنجی زۆربەی مێژوونووسە شارەزاکانی تردا (ل ١٠١ - ١٠٢). «کێشەی کورد لە تورکیا» (ل ٨٩) جێگە و بایەخی یەکەمی هەیە لای سافراستیان، بۆیە ئەو زۆر دەگمەن توخنی مێژووی پارچەکانی تری کوردستان کەوتووە، پێم سەیرە، بەوێنە، شێخ مەحموود و سمکۆ و قازی محەمەد ناویان لە «کورد و کوردستان»ەکەی ئەودا نەهاتووە. بەڵام هەرچۆن بێ هەموو ئەوانەی گوتمن و ئەوانەشی کە نەمگوتوون لە ئاستی گەورەیی کارەکەی دوکتۆر ئارشاک سافراستیاندا زۆر نانوێنن.

دەمێنێتەوە سەر وەرگێڕانەکەی بەڕێز کاک ئەمین شوان کە بەڕاستی شایستەی هەڵسەنگاندنی بەرزە، بەوردی و بێ دەسکاری، دێڕ بەدێڕ و وشە بەوشە شاکارەکەی سافراستیانی خستۆتە بەرگێکی ڕەوان و قەشەنگەوە و بەو جۆرە توانیویە دیارییەکی زۆر بەنرخ پێشکەش بەکتێبخانەی کوردی بکات. هیوادارم ڕووناکبیرانی کورد بەوردی «کورد و کوردستان»ەکەی مێژوونووسی پایە بڵند دوکتۆر ئارشاک سافراستیان بخوێننەوە و کەڵک لە دەرسە بایەخدارەکانی وەرگرن.

## گەلێکی یەکجار دێرین لە مێژوودا

«تەماشای شۆڕەسوارەکانمان کە، کونیان لە جگەردا نییە و نە ترس دەزانن نە گەڕانەوە، سەیری خێرایی و چاپووکی و ملنانی بێ پەروای ولاخەکانیان بکە. ڕۆڵەکانمان بەسەر پشتی ولاخەکانیانەوە، لە گەرمەی غاردا، نیشان لە دوژمنەکانیان ئەگرن و دەیانپێکن. تەنانەت دەتوانن خۆ شۆڕکەنەوە ژێر تەنگەی چارۆکانیان و لە نێوان چوار پەلیانەوە شەڕە تفەنگ بکەن...»

بەم قسانە، مستۆی ئەحمەد ئاغای سەرۆکی یەکێک لە لقەکانی هۆزی باتوان، کە لە بناری چیای جودی نیشتەجێن، لەگەڵمدا دەستی بەگفتوگۆ کرد. جودی چیایەکی هەمیشە پۆپەلاک بە بەفر پۆشراوی کوردستانە و دەکەوێتە باکوری شاری موسڵی عێراقەوە. مستۆ ئاغا، کە لەبەر خۆشەویستی لە لایەن دۆستە دڵسۆزەکانیەوە بەم ناوە بانگ دەکرا، ئابی ساڵی (١٩١٠) بەوپەڕی ڕێز و قەدر زانیەوە لە ڕەشماڵەکەی خۆیدا پێشوازی لێ کردم. کە ویستم دوعاخوازی لێ بکەم، زۆری کرد ڕۆژێکی تریش لای بمێنمەوە بۆ ئەوەی ئەو شەڕە تیرەگەریە ببینم کە لەگەڵ هۆزی شەرنەخی دراوسێی باتوانیەکاندا لە تەقینەوە دابوو، کۆنە قینێکی چەند ساڵە دەبوو لەو چەند ڕۆژەدا یەکلا بکرێ و ئەو خوێنەی لە ڕابردوودا ڕژێنرا بوو، دەبوو بەخوێنی تازە بسڕێتەوە، ئەگینا ئەوەی بەزیبوو هەتا هەتایە حەیا و حەیسیەتی لە ناوچەکەدا دەچوو و شەرەفی دەشکا و بەچاو بەرمژێری دەمایەوە.

ساڵی ١٩١٠، هەموو عێراق بەچیای جوودیشەوە، هێشتا هەر بەشێک بوو لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. تەنها دوو ساڵ بوو «تورکە لاوەکان» چنگیان لە دەسەلات گیر کردبوو و سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی خاوەن ناو و دەبدەبەیان لەسەر تەخت لادابوو. لە ماوەی سی ساڵ دەسەلاتی خوێناوییدا، ئەم سوڵتانە بەڕواڵەت دەستی لوتفی بەسەر سەردارە هەرە

گەورەکانی خێڵە کوردەکاندا دەهێنا و پایە و پلەی تایبەتی سەربازیی پێ دەبەخشین، تا لە ساڵی ١٩٠٢دا ئەم باوکەیان تەختی وەرگەڕا و گەلێکیان لە لایەن حکوومەتی «تورکە لاوەکانەوە» کەوتنە بەر وشار و لێ گیرپوونەوە. مستۆ ئاغا کە بەبناری ئەو چیا سەختەوە خۆی قایم کردبوو و، کۆمەڵێک تیرە و عەشیرەتی دۆست دەورەیان دابوو، لەوە نەدەچوو زۆری حیساب بۆ «تورکە لاوەکان» کردبێ ئەو هەر بەخوانەناس و دزێو و دەست و داوێن پیس ناوی دەبردن... و بەلای ئەوەوە تەنها شوومی و بەدبەختیان بەپێی خۆیانەوە بۆ وڵاتەکە دەهێنا. کارمان بەم قسانە نییە، ئێستا هەموو خەم و ئاواتی مستۆ ئاغا ئەوە بوو ئەم شەڕە لەگەڵ تیرەی نەیاری شەرنەخدا بتەقێنێتەوە و بیباتەوە. لەگەڵ بەرەبەیانی ڕۆژی دواییدا، شان بەشانی مستۆ ئاغا بەسواری بەرەو یاڵێک کەوتینە ڕێ کە لە دوورەوە بەسەر ئەو دەشتەیدا دەڕوانی کە بڕیار بوو ببێتە جێگە شەڕی هەردوو لا. بەم جۆرە لە مەیدانی شەڕ دوور و سەلامەت بووین. شان بەشانی مستۆ ئاغا، جگە لە برایەکی لە خۆی بچووکتری، دە سواری پڕ چەکی ئامادەش کە پاسەوانی تایبەتی ئاغا بوون، لەگەڵماندا بوون. کوڕە گەورەکەی، کە لاوێکی بەدیەن و تفەنگچییەکی زەبەردەست بوو و بەتەمەن خۆی دەدا لە چل ساڵ، سەرکردەیی لەشکرەکەی ئەمانی دەکرد. لەشکرەکەی ئاغا کە بریتی بوو لە چوار سەد سواری چاپوک و پڕ چەک و چالاک، خۆیان گەیاندبووە مەیدان و خەریکی ڕمبازێ و جەولان بوون و بەلاوکی کوردیی ئاگری تامەزرۆیی جەنگیان لە دڵدا جۆش دەدا. نزیکەی دوو سەعات چاوەڕێمان کرد، کەچی دوژمن دەرنەکەوت. ئەم دواکەوتنەش بەس بوو بۆ ئەوەی دەمی هەمانەی تووڕەیی مستۆ ئاغا و براکەی بەجنێو و نەفرین و تاوانی «ژنانەیی» و «ترسنۆکی» خستنە پاڵ دوژمن بکەنەوە.

مستۆ ئاغا خەریک بوو باسی ڕەوایی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بەدوژمنەکانی بۆ دەکردم، کە گوێمان لە دەسڕێژی دووری تفەنگ بوو لەوبەرمانەوە. لە نزیکەی شەش میلەوە بەدووربین دەمانبینی سوارەکانی

شەرنەخ بەگردەکاندا شۆڕ دەبوونەوە و بەرەو ئێمە دەهاتن. لەبەر تیشکی ڕۆژدا شیرەکانیان بەهەڵکێشراوی دەبریسکانەوە و بەنیشانەی هاتن تەقەیان بەئاسماندا دەکرد، چونکە لە یاسای نەنووسراوی تیرەگەریدا، قەدەغەیە لە شەڕی تۆڵەسەندنەوەی شەرەفدا دوژمن غافڵگیر بکرێ. مستۆ ئاغا براکەی بۆ پێشەوە نارد و بەدەم ئامۆژگاری نزاکردنەوە بۆ کوڕەکەی هەندێ دوعا و ئایەتی بەعەرەبی بۆی هەواڵە کرد. شەڕ دەستی پێ کرد، بەڵام ئەو تۆز و دوکەڵەی دەشتەکەی داپۆشی نەیهێشت لە شتێکی کەمی ڕووداوەکە بەولاوە، چیتر ببینین. گوێم لە تەقەی تفەنگ و ڕمپەی پێی ئەسپەکان بوو، جگە لە زەڵە و دەی دەی کردنی شەڕکەران. نزیکەی سەعاتێک تەقە بەردەوام بوو، دوایی بێ دەنگی بەرە بەرە باڵی بەسەر مەیدانەکەدا کێشا. لە گەڕانەوەماندا بینیم سوارەکانی مستۆ ئاغا کە هەموو لە تۆزدا سەر تا دامێن داپۆشرابوون، لە تەختاییەکی نزیکی هۆبەکەوە ڕیزیان بەستبوو و ئامادەی هەوڵ ڕاپۆرت بوون بیدەن بەسەرکردە. چ پیاوەکان چ ئەسپەکانیان لە ئارەقدا ڕەش و شین هەڵگەڕابوون. چاوەکانیان تووڕەیی و ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەیان لێ دەباری. بەڕاستی ئەم شەڕکەرە کوردانە ترسناک و زەندەقبەر بوون. مستۆ ئاغا زۆر بەشانازی و بڕواوە دەیڕوانییە ڕۆڵەکانی تیرەکەی بۆیە خۆی بەڕاست دەهاتە بەرچاو کە وتی «پشت بەخوا و بازووی ئەم ڕۆڵانە، دەتوانین هەموو دوژمنان بشکێنینەوە دواوە گەر هێرشمان بۆ بێنێ».

## رۆمییەکان دەبێ مل بشکێنن و بڕۆن

تا چل ساڵ لەمەوبەر ناتۆرەی ڕۆمی بەهەر داگیرکەر، دەستدرێژکەر یان کەسێک دەوترا کە لە ناوچەکانی بسفور و ئاسیای بچووکەوە هاتبێ. سنووری ڕۆمی بەگشتی لە ڕۆژهەلاتی خەتی سامسۆن - سیواس - کیلیکیاوە دەستی پێ دەکرد. چ ڕۆمەکان چ بیزەنتییەکان چ تورکەکان هەموو بێ سەروبەر و جیاوازی ڕۆمی بوون. بێ گومان وشەکە، لە دوو توێی خۆیدا، پڕ بوو لە سووکی و خوانەناسی و هەرچی سیفەت و خووی خراپ هەیە دەکەوتە سەر ئەو کەسەی بەڕۆمی ناو دەبرا. تا ئێستاش ئەم وشەیە و ماناکەی هەروا باوە لە ناو ئەو تیرە کوردانەدا کە دوور دەستن و بای بزووتنەوە هاوچاخەکانیان بەرنەکەوتووە، هەروەها - ئەگەرچی بەڕادەیەکی کەمتر - لە ناو عەرەبی باکور و ئەرمەن و فارسەکانی ڕۆژئاوادا. گەلێک ڕووداو هەن کە ڕەنگدانەوەی ئەم ڕاستییەن لە نێوان تیرە کوردە دێرینەکاندا و پیاو بۆ نموونە دەتوانێ باسی یەکێکیان بکا:

بشاری چەتۆ ئاغا جەنگاوەرێکی بەڕاستی شێردڵی چیایی، سەرکردەی بەسەرکردە ناسراو و پڕ ڕێزی کۆمەڵەی پێنج تیرەی کورد بوو، کە لە هەموو لێقەومانێکدا دەیتوانی سێ هەزار سواری تەیاری پڕ چەک و تفاق سوارکا. قەلاکەی بشاری چەتۆ بەپاڵ لوتکەیەکی بڵندی چیای تۆرۆسەوە دەتووت هێلانەی سیمرخە قوت بۆتەوە. لەوێ دەستی هیچ نەیارێکی پێ نەدەگەیشت. چ لە سەرتاسەری کوردستان و چ لە ناو تیرە کوردەکانی عێراق و ئێراندا، بەجەنگاوەرێکی نەترس و شەڕکەرێکی بەجەرگ و ڕەشید و بێ هاوتا ناوبانگی بلاو بووبووەوە. لە هەمان کاتدا، مێگەلە ئاژەڵی نەک هەر دەشت و دۆڵ، بەڵکو بناری چیاکانیشی گرتبووەوە. هەموو ساڵێک هەر لە سەرەتای هاوینەوە، چەرچی عەرەب لە حەلەب و شامەوە، بۆ زۆزان و شیو و دۆڵە فێنکەکانی کوردستان و ئەرمەنستان دەهاتن تا بەمێگەل و گاگەل و ڕەوە مەڕ و بزن و ئەسپ و گا و گۆتاڵ

بکرن. بەم جۆرە خورجی پارەی ئەم سەردارە هەمیشە دارماڵ بوو لە لیرەی زێڕ. لەگەڵ ئەمەشدا بشاری چەتۆ، قورۆشێک چییە باجی بەرۆمی، واتە دەولەتی تورک نەدەدا، چونکە بەگوێرەی بۆچوونی ئەو، هەموو ئەو پاڵ و پێ دەشتانەی کە ئاژەڵەکانی تێدا بەخێو دەکران و دۆڵەکانی دەوروبەری کە ڕۆڵەکانی تیرەکەی کشتوکاڵیان لێ دەکرد، پشتاوپشت موڵکی باو و باپیرانی ئەو بوون نەک هی خەڵکی تر. ئەو جگە لە یاسای تیرەکەی هیچ یاسایەکی تری نەدەناسی، بۆیە خۆی بەپابەند نەدەزانی، زەویانە، یان مەڕانە بەرۆمییە خوانەناسەکان بدا یان سەربازیان بۆ لەشکرەکەیان بداتێ. بشاری چەتۆ، بەڕاستی پاڵەوانی کەساسان و هەژاران بوو بەرامبەر ستەمکار و تاڵانکەران، ئەگەرچی دەبێ دان بەوەشدا بنێین کە ڕۆڵەکانی تیرەکەی، جار بەجار لە چیاکانەوە شۆڕ دەبوونەوە و لە پێچ و پەنای گردەکان و دوو توێی شیو و گەرووی دەرەکاندا خۆیان مەڵاس دەدا و هەر کاروانێک بەوێدا، لە نێوان سوریا و عێراق، کوردستان و ئەرمەنستاندا، تێپەڕ بووایە هەڵمەتیان دەبردە سەری و ڕووتیان دەکردەوە.

پاش شۆڕشەکەی (١٩٠٨)ی تورکە لاوەکان، وەکو لە سەرەوە باسمان کرد، دەولەت دەستی کرد بەهێرشێکی یەکبین و ڕێک، بەتایبەتی بۆ سەر ئەو تیرە کوردانەی کە بەر لەوە سەر بەسوڵتانی لەسەر تەخت لادراو بوون، یان لە بیست ساڵی ڕابردوودا ناو و ناوبانگی سەرپێچی کردنیان دەرکردبوو. لە چاوی مێزەکانی دادگای دیاربەکر یان بتلیسدا دەیان پسوولەی گرتن بۆ بشاری چەتۆ یان چوار کوڕەکەی خەوتبوون، کە فەرمانبەر و زەفتیەکانی دەولەت نەیانتوانیبوو پێیانی بگەیەنن، چونکە هەر ئەفسەر یان زەفتییەیەک پرکێشی نزیک کەوتنەوەی لە هێلانەی ئەم هەڵۆ تیژ باڵە بکردایە، جارێکی تر بەزیندوویی چاوی بەخانە و ئاشیانەی خۆی نەدەکەوتەوە.

نازانم بەچ فێڵ و تەڵەیەک بوو، لە ئەیلوولی (١٩٠٨)دا دەولەت توانی یەکێک لە کوڕەکان و کوڕەزایەکی لە دۆڵێکدا لە نزیکی دیاربەکر بخاتە

داوەوە. بشاری چەتۆ کە ئەو حەلە لە تەمەنی شەست سالیدا بوو، بەلام هەر چوست و چالاک و هێشتا بەتوانا و هەرەکەت بوو، هەر کە هەوالی گرتنی کوڕ و کوڕەزاکەی پێ گەیشت، وەکو هەلۆ بەهەیبەت و پڕچنگەکانی چیای تۆرۆس ڕاپەڕی و نامەیەکی نهێنی بۆ دۆستە دلسۆزەکانی لە دیاربەکر و موسل و بتلیس نووسی (چونکە ناوچەکەی سەر بەبتلیس بوو ئەگەرچی لەو دوو شارەی پێشووترەوە نزیکتر بوو) و تێیدا «هەڕەشەی توندی سەندنی تۆلەی چەند قاتی لە ڕۆمییە نامەردەکان کرد». ئەوەشی خستەوە بیریان، چۆن لە شەڕەکانی چەرخی ڕابردووی نێوان کورد و تورکدا ئەو سوپا تورکەی ئەو کاتە تازە دامەزرا بوو، مالی باپیریان تۆپباران و وێران کرد و باپیریان کوشت و دەست و گوێی خەلکی بێ تاوانیان بڕی.

لە سوریاوە یەک ڕێگای کاروان بۆ دۆلی ناوەڕاستی ڕووباری دیجلە دێت. ڕێگایەکی تریش لە شاری دیاربەکرەوە بۆ سەرچاوەکانی ڕووبارەکە دێت و دەچێتە هەردوو شاری سێرت و بتلیسەوە. بشاری چەتۆ و پیاوەکانی بەئاسانی دەتوانن ئەم دوو ڕێیە لە نێوان بتلیس و دیاربەکردا بگرن و نەهێلن باڵدار یان نالداریان پێدا ڕەت بێ. ئەوان لە ڕابردوودا چەند جار ئەم ڕێیانەیان گرتبوو، لەم ڕۆژگارەدا کە کەس نەیدەزانی دونیا چی بەسەر دێ و شۆڕش دەگاتە کوێ، حکوومەتی تورک لە ئەستەمبوول زۆر بەوریایی و وردییەوە فەرمانبەرە گەورەکانی خۆی هەلدەبژارد. پەیتا پەیتا والییەکانی دەگۆڕی تا نەوەک بەلای کۆنەپەرستاندا لاکەنەوە، بەتایبەتی لەو ناوچانەدا کە دووردەست بوون و لە پایتەختەوە بەئاسانی دەستیان نەدەگەیشتێ. لەبەر ئەمە هەر لە سەرەتای سالی (۱۹۰۹)دا «تورکێنکی لاو» کە چەند سالی لە پاریس بەخوێندن بەسەر بردبوو بەوالیبیەتی و فەرماندەیی گشتی نێررا بۆ بتلیس.

کابرا هێشتا جێگاکەی گەرم نەکردبووەوە بەدوای ژنەکەیدا نارد و ڕایسپارد تەخت و مۆبیلەی مالەکەی لە ئەستەمبوولەوە بۆ بهێنن. ژنەکە لە دەریای ناوەڕاستەوە و بەسووریادا کەوتە ڕێ. بەلام، لەبەر نەبوونی

ئێمنایەتی ڕێگاوبان، چەند هەفتە لە دیاربەکر دواکەوت. هیچ گومان لەوەدا نییە کە بشاری لەمەڕ خۆمان دەستێکی لەم نەبوونی ئێمنایەتییە و هێرشی بەردەوامی سەر کاروانەکاندا هەبووە. دیارە بشاری چەتۆ بۆنی ئەوەی کردووە کە ئەم خانمە کەوتۆتە چ تەنگنایەکەوە و بڕیاری داوە تۆڵەی خۆی بەوە بسێنێتەوە کە تا دەتوانێ سەرشۆڕیی بەسەر ملی پیرە ڕۆمییدا بسەپێنێ. بۆ ئەم مەبەستە ئازاترینی سوارەکانی هەڵبژارد و لە پێچ و پەنای قایی دەوروبەری ڕێگاکەدا حەشاری دان، تا کاروانی خانم دێت. والی خۆی کە ئاگاداری ئەو مەترسی و خەتەرە بوو، نزیکەی پانزە زەفتیە (پۆلیسی سوارەی چەکدار)ی نارد تا بکەونە تەک کاروانی ژنەکەی لە دیاربەکرەوە بۆ بتلیس. لە یەکەم هەفتەی ئەیلوولی ئەو ساڵەدا لە ناوچە ڕۆژهەڵاتییەکانی تورکیادا هەواڵ وا بڵاو بووەوە کە ڕێگری کورد خانمێکی ئەستەمبووڵییان ڕفاندووە (واتە ژنی والی و فەرماندەی گشتی بتلیس) و لەگەڵ خۆیاندا بۆ قووڵایی چیاکان بردوویانە. دوایی ئاشکرا بوو کە نزیکەی چل میل لە باکووری ڕۆژهەڵاتی دیاربەکر و لەسەر ڕووبارەکە پیاوەکانی بشاری چەتۆ بەڕۆژی نیوەڕۆ هەڵمەتیان بردۆتە سەر کاروانەکە و پۆلیسەکانیان چەک کردووە، بێ ئەوەی ئەمان تەقەیەک بکەن و دوای بەرەڵاکردنیان، هەموو کاروانەکەیان بەژنی والی و کەنیزەک و وڵاخە بار بەرەکان و زەڵامەکانەوە بەرەو بڵندایییە سەرکەشەکان پێچاوەتەوە.

ڕۆژێک لە ڕۆژانی دوای ئەم ڕووداوە، والیم بینی، لەبەر خەم و پەژارە و هەستی شەرم و شوورەیی بارە گوێزت لێ بنایە خرەی نەدەهات. واقی وڕمابوو، بەوپەڕی داخەوە باسی باری «دڕندانە»یی وڵاتەکە و ڕەفتاری دژ بەبەشەرانەی میللەتەکەی دەکرد. دەیپرسی «دوای شەڕێک دژی ئەڵبانییەکان و یەکێکی تر دژی عەرەبەکان، تورکیای شۆڕشگێڕ چۆن توانای یەکێکی تری دژ بەتیرە کوردەکان هەیە؟ تەنها سوپایەکی گەورە دەتوانێ کوردستان ببەزێنی و سەری پێ دانەوێنێ»... دڵم زۆرتر بۆیە پێی دەسووتا، کە ئەوەندەی بۆ تەخت و مۆبیلە لە ڤیەننا دروستکراوەکانی کە

بەتایبەتی ڕایسپارد بوو لە بازاڕی لاڤانتینی ئەستەمبووڵ بۆی بکڕن، بەخەمەوە بوو، ئەوەندە بۆ ژنەکەی و کەنیزەکانی بەخەمەوە نەبوو. لەوانەیە ئەم تورکە ڕۆشنبیرە لە دڵی خۆیدا ئاواتەخوازی ئەوە بووبێ «ئەم ناوچە دڕندەیە بەو بیروباوەڕە شارستانییی بکا کە لە ئەورووپاوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی».

دوای ئەوە، تەنها بەکەوتنە بەینی شێخێکی گەورەی ناوچەکە، واتە پیاوێکی ئایینی یەکجار پلە و پایە بەرز لە دڵی سەرکردەدا، ژنی والی بەرەڵا کرا و گەڕایەوە لای مێردەکەی بێ ئەوەی کەس پەنجەیەکی بۆ بەرێ یان بەهیچ جۆرێک دڵ ئازار بکرێ، ئەوانیش لەجیاتی ئەمە کوڕ و کوڕەزاکەی ئەمیان لە زیندانی دیاربەکر ئازاد کرد. ئەمە پەیڕەوی ئەو یاسا نەنووسراوەیە کە بۆ ڕێزگرتن لە پەنابەر و بێ دەسەڵات لە ڕۆژهەڵاتی دێرینی پڕ لە شارستانییەتدا حوکمفەرمایە - ئەو کەسەی پەنات دەباتە بەر چ پیاو چ ژن، یان بێ دەسەڵات دێتە بەردەستت، ئەمانەتێکی پیرۆزی خودایە لە ئەستۆتدا. بشاری چەتۆش کە پارێزگار و پابەندێکی گەورەی یاسای باو و باپیران بوو، نەیدەتوانی لەم ڕێیە بەولاوە هەڵبژێرێ، با دوژمن ڕۆمییش بێ. بەڵام مۆبیلە لە ڤیەننا دروستکراوەکانی فەرماندەی گشتی کە بۆ چەند ساڵ پاش ئەوە لە هەموو ئەو دەوروبەرەدا بوون بەمایەی نوکتە و پێکەنین، ئەوەندە بەپێچ و پەنا و هەوراز و نشێوی بناری چیاکاندا داگیران و بارکرانەوە تا هەپروون بوون. داخەکەم بۆ خاوەنە ڕۆشنبیرەکەیان!

بشاری چەتۆی سەرکردەی ڕۆمانسی، لە بارەگای سەختە چیاییەکەیدا مایەوە. لە شەڕەکانی نێوان کورد و تورکی ساڵەکانی (١٩٣٠ - ١٩٣١)دا، بەهەموو هێزەکەیەوە چووە مەیدانی جەنگەوە و بۆ سەربەخۆیی کوردستان چەند مانگی ڕەبەق هێزە نیزامییەکانی تورکی لە گرد و تەپۆلکەکانی دەوروبەری دیاربەکر ڕاونا و شکاند. ساڵی (١٩٣١) لە بارودۆخێکدا کە تا ئێستا ساخ نەکراوەتەوە، لە لایەن تورکەکانەوە کێشرایە داوێکەوە و لەگەڵ سێ کوڕیدا کوژران.

ژیان و کارنامەی ئەم کەڵەپیاوە کە جیهانی دەرەوە هیچی لە بارەوە نازانێ وێ دەچێ چیرۆکێک بێ پڕ لە شتی مەزن و گرانبەها. لە ژیانی لاوێتیدا، تا بلێی کابرایەکی تاکڕەو، ئاغایەکی بێ سەردار و ژوور دەستی ناوچەی خۆی، بێ ئاگا و گوێ ئاخنراو لە هەر بانگێکی ڕاپەڕین و سەربلندکردنەوەی کوردان، کەچی لە پیریدا، بۆ یەکێتی میللەتەکەی وریا بووەوە و خۆی بەدڵ و بەگیان خستە ناو گێژەنگی خەبات و تێکۆشانەوە بۆ سەربەخۆیی گەلەکەی تا لە دەوروبەری هەشتا ساڵیدا بوو بەقوربانی مەسەلەکە.

# فەسڵی یەکەم

## هەندێ بیروڕای هەڵە دەربارەی ڕەگەزی کوردان

لەوانەیە لە هەموو جیهانی کۆندا، هیچ نەتەوەیەکی تر هەندەی کورد نەکەوتبێتە بەر پلاری شێواندن و بۆچوونی هەڵە و ناڕاست. بگرە هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە، لەوانەیە هیچ گەلێکی تری نیشتەجێی ناوچەیەکی جوگرافیایی ناسراو و ئاشکرا ئەوەندەی کورد بەر گەردەلوولی ڕەشی شاردنەوە و چەواشەکاری و لە بەرچاو ڕەشکردن نەکەوتبێ. ئەم ڕاستییە دەبێ هەر لە سەرەتاوە دووپات بکرێتەوە تا کێشە مێژوویییەکە چاک بخرێتە بەرچاو و مەسەلەی کورد بەو جۆرە تاووتوێ بکرێ کە ئەمڕۆ خۆی دەردەخا و دێتە پێشەوە.

هەندێ لە پادشا هەرە دێرینە سۆمەری و ئەکەدی هەروەها بابلییەکان تا دەگاتە زینۆفۆنی سەرکردەی هێرشی دە هەزار جەنگاوەر بۆ ڕۆژهەڵات بەسادەیی و پڕ لە ڕاستی هەڵسوکەوت و لووت بەلووتدا تەقینی خۆیان لەگەڵ ئەم گەلە چیاییە سەر شۆڕنەکەرەدا باس کردووە... ئەو ڕەفتار و بەرابەرکاریەی کە ئەم کوردانە چ لەگەڵ پادشانشینە کۆنەکانی ناوچەکە یان لەگەڵ یۆنانییە بەرەو دوا هەڵاتوەکاندا نواندوویانە لەوانەیە لە هی خەڵکی تر زبرتر و تیژتر بووبێ، بەڵام هەرگیز ڕەوا نییە ئەم تۆمارە کۆنینانەی دەربارەی ڕەفتاری ئەم گەلە بەگشتی دانراون بکرێن بەبەڵگە و بناغە بۆ ئەو ناو و ناتۆرەیە کە لە مێژووی هاوچەرخدا بوونەتە پینەی ناوشان بۆیان... هەر لە پادشا بەسام و هێزەکانی ئاشوورەوە بگرە تا دەگاتە مەغۆلەکان، ئینجا تورک و فارسەکان، هەموو مۆرێکیان بەم گەلەوە ناوە کە تا ئێستا ئاسەواری نەسڕاوەتەوە. بەداخەوە ئەو گەڕیدە و نێرراوە بێگانانەش کە لەم سێ سەدەیەی دواییدا سەریان لە کوردستان داوە، مەگەر بەدەگمەن ئەگینا جگە لە جوینەوەی بیروڕا و بۆچوونی شەخسی و ڕووداوی ناخۆش کە لە سەفەرەکان بەرەنگاریان بووە و باسکردنەوەی هەڵە

و چەوتییەکانی پێشوو شتێکی ئەوتۆ بەبایەخ و تامداریان نەخستۆتە سەر مێژووی ئەم گەلە کە پڕشنگداریی و پڕ ڕەونەقیی لە مێژووی خەڵکی تر هەرگیز کەمتر نییە... وەکو دەردەکەوێ گەورەترین گوناهی ئەم گەلە ئەوەیە ناتوانێ بەژێردەستەیی بژێ جا ئەم ژێردەستەیییە بۆ داگیرکەر بێ یان بۆ هێزێکی سەربەخۆی حوکمڕان یان بۆ ئیمپراتۆریەتێکی دراوسێ. بەڵام خێڵە کوردە ڕەسەنەکان کە فێری ساڵەها حوکمی خۆبەخۆیی و سەربەخۆ بوونە لەسەر سەرزەمینی خۆیان بەهەڵە یان گوناهی نازانن تا دەتوانن بەتوندی بەرهەڵستی هەر بێگانەیەک بکەن کە بێتە ناویانەوە و بیەوێ خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ. تا ئەو دەمەی چەکی جەنگ ڕم و تیروکەوان و قۆچەقانیی بووە دژی گەورەترین ئیمپراتۆر و داگیرکەر و بوغرای مێژوو ئازایانە وەستاون ئەگەرچی لەو کاتەوە کە بارووت پەیدا بووە و تفەنگی تیژ و خێرا تەقێن دروست کراوە، تای تەرازوویان بەرانبەر بەئیمپراتۆریەتە دراوسێکان واتە تورک و ئێران، تا دەگاتە سەرەتای ئەم سەدەیە لەنگ بووە و، مەسەلەکان هەمیشە هەر بەزیانی ئەمان تەواو بوون(أ)...

بەر لەوەی بێینە سەر باسی شتە سەرەکییەکانی جوگرافیای کوردستان، وای بەباش دەزانین باسێکی سەرەتای مێژووی گەلی کورد بکەین، واتە یەکەم جار ناویان کەی و لە کوێی مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی دێرینی پڕ شارستانییەدا هەڵیداوە. کەوا بێ با لە پێشدا بەدوای وشەی کورددا بگەڕێین... تا ئەوەندەی ئەو بەڵگە نووسراوانەی کە لە بەردەستن دەرفەت دەدەن، ئەم ناوە یەکەم جار لە کتێبێکدا کە بەزمانی پەهلەوی نووسراوە بەشێوەی «کورد، کوردان» دەردەکەوێ. ئەردەشێری بابەکانی دانەر و دامەزرێنەری بنەماڵەی ساسانی لە ساڵی (٢٢٦)ی پێش زایینیدا، کە باسی دوژمنەکان دەکا، دێتە سەر (مادیگ) ناوێک کە «پادشای کوردان» بووە[1].

---

(1) Darb Peshotan Sanjana: Karnamkh: Artakhshiri Papakan 1896 - Page 22 (= Kurdan Shahi Madrig).

وەکو دەردەکەوێ ئەم ئەردەشێرە کە بە لەناوبەری تەختی (پارثیان) دادەنرێ «گۆتۆ»ی کۆنە ناوی کردووە بەکورد. مێژووناسانی بەناوبانگی عەرەبی وەکو (الطبری) و (المسعودی) ئەم ناوەیان لە ساسانییەکانەوە وەرگرتووە و دوا بەدوای ئەوانیش هەر لە شێوەی «کورد»دا ناسراوە تا دەگاتە ئەم سەردەمەی ئێستامان...

ئەگەر شان هەڵتەکاندن و چارە گرژکردنی تورک و فارسەکان لە بارەی بنەڕەتی ئەو وشەیەوە بخەینە پشتگوێ، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە ناوەکە تا بڵێی ڕەسەن و بێ خەوشە، لە ڕاستیدا، ناوەکە لە سەرزەمین و پادشایەتی «گۆتۆ» و گەلی «گۆتۆ»وە وەرگیراوە و پیتی «ڕێ»ی دوای پیتی «واو»ە کە «گۆرتۆ - گۆتۆ» قووت دراوە ئەمەش بەگشتی لە سەرجەمی زمانە هیندۆ ئەوروپییەکاندا باوە، بەتایبەتی ئەوانەی ڕۆژهەڵات، وەکو کوردی و ئەرمەنی و سانسکریتی و یۆنانی. نووسراوە بزماریە کۆنەکان کە بەزمانی سۆمەری نووسراون بەباشی دەری دەخەن کە سەرزەمینی «گۆتۆ» یەکێک بووە لە پادشانشینە هەرە کۆن و سەربەخۆکانی ڕۆژهەلاتی دێرینی پڕ لە شارستانیی...

ئەم گەلە هاوسەردەمی سۆمەرییەکان و ئەکەدییەکان و ئیلامی و ئەرمەنییەکان بووە... لە ناو ئەو نووسراوە بزمارییانەدا کە تا ئێستا وەرگێڕراون و بڵاو کراونەتەوە، یەکەم جار ناوی سەرزەمینی «گۆتۆ» لە خشتە بەردێکدا دەردەکەوێ کە - لۆگال ئەنێ مۆندۆ -ی پادشای شاری «ئەداب»ی سۆمەری کە ئێستا بە«بیسمایا» ناسراوە نووسیویەتی... ئەم شاری بیسمایایە لە خوارووی عێراق و لە دەوروبەری زێی فوراتە. لە خشتێکدا کە وەکو بەردی بناغە بۆ یادگار دانراوە و لە بیسمایا دۆزراوەتەوە لۆگال ئەنێ مۆندۆ ناوی سەرزەمینی بەربلاو و بەرینی گۆتۆ لە پاڵ سەرزەمینی سوبارتوو ئیلامدا دەبا. مانای هەموو نووسراوەکە زۆر ڕوون نییە، بەلام گەر لەگەڵ ئەو زانیارییانەدا بەراورد بکرێ کە لەوەودوا لە ئەکەدییەکانەوە هاتوونەتە پشت، شارەزایان وای بۆ دەچن کە ئەم پادشا

سۆمەرییە باسی سەرکەوتنی خۆی بەسەر ئەو ولاتانەدا دەکا کە ناوی بردوون و لە پاڵ شانازی کردن بەو سەرکەوتنەوە خۆی بە«سەرگەورەی هەر چوارگۆشەی زەوی» دادەنێ[1].

ناتوانرێ تۆمارێکی رێکوپێکی کات و ساتی رووداوەکانی ئەو سەردەمە دابنرێ چونکە ســـــەرچاوەی ئەوتـۆی دوا بەدوای یەک و ورد و ڕاست بەدەستەوە نییە کە ماوەی حوکمرانی ئەم پادشا سۆمەرییەی ئادابی پێ دەربخرێ کە وای پێ دەچێ یەکێک بێ لە پادشاکانی هەشتەم پشتی پاش لافاوەکەی نووح و نزیکەی نەوەد ساڵ حوکمفەرمایی کردبێ[2]... بەگوێرەی ئەو تۆمارە کورتەی کە سیدنی سمیث[3] دایناوە و تا ڕادەیەک باوەڕ کردەنییە لەوانەیە ئەم پادشا سۆمەرییە لە دەوروبەری (٢٣٥٠)ی پ. زدا لەسەر تەخت بووبێ.

ئەو دەقە تاک و تەرایانەی کە تا ئێستا هاتوونەتە دەست هەر ئەوە دەسەلمێنن کە لە دەوروبەری سەدەی بیست و چوارەمی پێش هاتنە دنیای مەسیحەوە سەرزەمینی شانشیی گۆتێ، کە کوردستانی ئەم سەردەمەی ئێستامان دەگرێتەوە هەبووە و هەموو پادشا سۆمەرییەکان بەولاتێکی سەربەخۆ ناسیویانە، شان بەشانی ولاتەکانی ئیلام و سوبارتو، ئەگەرچی ئەم دوو ولاتە لە ولاتی گۆتێ گەورەتر و ناسراوتر بوون. لەوەدوا ناوی سەرزەمینی گۆتێ لە دەیەها بەڵگەی وەکو نووسراوە ئاینییەکان، ساڵنامەکان، دەقە گەردوون شوناسییەکان و شتی تردا هێنراوە. لە هەموو ئەو بەڵگانەدا ئەم گەلە بەدوژمن و نەیاری ئەم دەوڵەتە - شارانە دانراوە کە لێرە و لەوێی دەشتەکانی خوارووی عێراقدا قوت بووبوونەوە...

هەندێ جار بەهێزی تایبەتیی خۆیان، هەندێ جاری تر پاڵ بەپاڵی ئیلامییەکان، یان دانیشتوانی ولاتی تورووکو یان سوبارتو یان ولاتە

---

(1) A. Urgnad. Subartu... (1936) pp. 36 ets 99.

(2) S. H. Lanqdon: The Third Dynasty of kish: In Tbe Cambridge Ancient History Vol. (1932) pp. 369 Sqq. 390.

(3) Sidney Smith: Alalakh and Chronology: 1940 - p. 29.

دراوسێکانی تر، پادشاکانی گۆتۆ کە وڵاتی بابل ئینجا سەرزەمینی ئاشوورییەکانی دوای ئەویان داگیر و حوکمڕانی کردووە، هەمیشە بۆ هێرش بردنە سەر دانیشتوە تازە نیشتەجێکانی ڕۆژئاوای چیاکانی زاگرۆس ئامادە و تەیار بوونە(ب)...

تێکستە ئایینییەکان، کە لەبەر ئەوەی ئایینین، بەباشترین بەڵگەی چاک پارێزراوی پادشا نشینە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات دەژمێررێن، لە زۆر جێگادا باسی بەسەرداداتی لەناکاوی شارەکانی سۆمەرییەکان یان ئەکەدییەکان دەکەن لە لایەن دانیشتوانی گۆتۆوە، ئەم بەڵگانە وا نیشان دەدەن کە خەڵکی ئەم سەرزەمینی گۆتۆیە هەمیشە لە ناو چیاکانی خۆیاندا بەسەربەستی و بێ سەرداری بێگانە ژیاون...

لە ساڵنامەیەکی ئایینیدا سەرگوزەشتەیەک گێڕراوەتەوە، لە سەرگوزەشتەکەدا وا باس کراوە کەوا شارگالیشاری (١٩٠٠ پ. ز) کە یەکێک بووە لە پادشاکانی ئەکەد و دوا بەدوای نارامسین هاتۆتە سەر تەخت، چەند شەڕی لەگەڵ سەرزەمینی گۆتۆدا بووە و بەوەوە شانازی دەکا کە گوایە شارلاکی پادشای وڵاتی گۆتۆی بەدیل گرتووە. هیچ هۆیەک نییە کە لە بارەی وردی و ڕاستی ئەم سەرگوزەشتەیەوە گومانمان هەبێ. با ئەم سەرکەوتنە تاکە کەسیانەش بخەینە لاوە، بەڵام گەر تیشکی باش بخەینە سەر ڕاستییەکانی ئەو سەردەمە بەڕوونی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا چ سۆمەرییەکان، چ ئەکەدییەکان هەروەها ئاشوورییە بەهێز و تواناکانی سەدەکانی دواتر، هەموو ئەم شەڕوشۆڕ و دوژمنایەتییە دووروودرێژەیان لەگەڵ وڵاتی گۆتۆدا هەر بۆ ئەو مەبەستە بووە نەهێڵن ئەمان لە چیاکانیانەوە بەرەو پێدەشتە بەپیت و بەرەکەتەکانی میزۆپۆتامیا بێنە خوارەوە.

ئینجا با بزانین سەرزەمینی گۆتۆ کوێ و کوێ دەگرێتەوە. ئەمە لە لایەن زۆربەی زۆری لێکۆڵەرەوە لێزانە مێژووییەکانەوە، لەبەر تیشکی ئەو ڕۆشناییە کەمەی بەڵگە پچڕ پچڕ و جیاجیاکان دەیدەنە دەستەوە، باس

کراوه، کورتەی هەموو بیروڕاکان لە لایەن آر، کامپبیل تۆمسنەوە[1] وا داڕێژراوە کەوا وڵاتی گۆتۆ ئەو سەرزەمینە چوارگۆشەیە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە نێوان زێی بچووک و ڕووباری دیجلە و هەڵەتەکانی سلێمانی و زێی دیالەوە. (سیروان - وەرگێڕ).

پایتەختەکەیان لە شوێنێک بووە کە ناو یان دەوروبەری شاری کەرکووکی ئەمڕۆ دەگرێتەوە و ئەو سەردەمە بەئەراپخا بەناوبانگ بووە و ئێستا هەشتا میل لە باکوری بەغداوە دوورە و لەم سەردەمەدا مەڵبەندێکی گەورەی نەوت دەرهێنانە...

هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری (٦١٢ - ٦٠٦) پ. ز، کە وەکو دەردەکەوێ تا ئەو سەردەمە هەرچەندە شلیش بووبێ بەرانبەریان، بەڵام زۆر و کەم گۆتۆکانی لە هەڵەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەدا ڕاگیر کردووە، بوو بەمایەی لاچوونی کۆسپ و بەر بەرەڵاوبوونی ئەم گەلە و پرتە و بڵاوەکردنی بەهەر چوار لادا... کە کۆرشی پادشای فارس بابلی گرت سوارە کوردە گۆتۆییەکان پێشڕەوی لەشکرەکەی بوون (٥٣٨ پ. ز) و کە زینۆفۆن بەخۆی و دە هەزار زەلامەکەیەوە گەیشتە تۆرۆس سەیری کرد هەر لە شاری موسڵەوە بگرە هەتا دەگەیتە ڕووباری کەنتریتیس - واتە ئاوی بوهتانی ئێستاکە - و بەشی ڕۆژهەڵاتی دیجلە کە سنوورە لە نێوان ئەرمەنستان و کاردۆخدا، هۆزە کوردە کاردۆخییەکان لە شیو و دۆڵ و بەندەنەکانی چیای تۆرۆسدا بۆیان دانووساون...

بەڵگەی ئەوها نوێ، ئەویش لە لایەن یەکێکەوە وەک زینۆفۆن کە بەچاوی خۆی ڕووداوەکانی بینیوە وای دەردەخا کە تا ئەو سەردەمەی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری لە برەودا بوو، هیچ ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ گرنگ لە دابەشکاری نەتەوەیی و لە چوارچێوەی ڕۆژهەڵاتی کۆندا نەهاتۆتە دی.

---

(1) Tbe Cambridge Ancient History: Vol. 111. pp. 218. 223 et Passim: of. Sidney Smith: Early History of Assyria up to 1000 B. C. (1928) the Word Gutium. Index.

ئیمپراتۆریەتی ئاشووری بارودۆخی سیاسی و نەتەوەیی ڕۆژهەڵاتی کۆنی بەدرێژایی نزیکەی حەوت سەدە (١٣٠٠ - ٦٠٠ پ. ز) وەکو خۆی ڕاگرت و نەیهێشت بگۆڕێ...

ڕاستە زۆر جار پادشا ئاشوورییەکان دانیشتوانی شارێکیان بەتەواوەتی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا دەگواستەوە یان بەپێچەوانەوە، بەڵام ئەو خێڵانەی فێری ژیانی ناو چیاکانی دەوروبەر بوون، زۆر بەگرانی ملیان بۆ بەزۆر نیشتەجێکردنی پێدەشتە تەختەکان دەدا. کۆچکردنی گەلێک لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر ئەو باوەڕ و تیۆرەی کە تا ئێستا هەندێ لە مێژووناسەکان وەکو ڕاستییەکی نەگۆڕ لەسەری سوورن، وا دەردەکەوێ بنەمایەکی ڕاست و سفتی ئەوتۆی نەبێ، بەتایبەتی ئەگەر مەسەلەکە ڕەگەزە ڕەسەنەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆن بگرێتەوە. ئەوەتا کوردەکان، عەرەبەکان، ئەرمەنییەکان، ئاسوورییەکان و گەلێ نەتەوەی تر کە هەموو ڕەگەزی ڕەسەن و سەربەخۆن، لەسەر زەمینی نەتەوەیی خۆیاندا ماون و هەر لە سەردەمەکانی پێش مێژووەوە بگرە تا ئەم سەردەمانەی ئێستامان هەر تێیاندا چەسپیون (ج).

## یەکەم پادشایەتی گۆتتۆ - کورد کە حوکمڕانی بابلی کردووە

## (دەوروبەری ٢٣٠٠ - ٢١٧٥) پ. ز

بنەماڵەی ئەکەدییەکان لە ماوەی سێ سەد ساڵ حوکمڕانییدا تەنها دوو کەڵەپیاویان لێ هەڵکەوتووە، کە یەکێکیان شارۆکینی لەشکرشکێنە. لەوە بەولاوە وا دەردەکەوێ ئاژاوە و شەڕی ناوخۆ باو بووبێ بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەردەمی ئەم بنەماڵە سامییە بەناوبانگەدا... خشتێک کە نووسراوەکەی سەری هی ئەو سەردەمەیە بارودۆخی گشتی ئەوسا وا باس دەکا کە «کەس نەیدەزانی کێ پادشایە و کێ پادشا نییە». بەڕاستی دەبوو بەشتێکی یەکجار سەرسوڕێنەر، گەر چیاییەکانی ولاتی گۆتتۆ کە بەچاوی خۆیان ئەم بارودۆخەی پێدەشتەکانی بەردەمیان دەبینی، نەهاتنایەتە خوارەوە و هەوساری کاریان لە دەشت و شارەکاندا نەگرتایەتە دەستەوە، سەرەنجام کارەکە هەر بەم جۆرەش شکایەوە، ئەوە بوو پادشایەکی گۆتتۆکان کە پێدەچێ ناوی ئیمبیا بووبێ، دەستی بەسەر بابلدا گرت و حوکمڕانیی شەرعی خۆی تێیدا داکوتا و بنەماڵەی ئەکەدییانی لێ وەدەر نا، بەهەمان شێوە کە نزیکەی دوو هەزار ساڵ لەوەودوا کۆرشی پادشای فارس لە بڵندایییەکانی ئەنزانەوە (سووسە!؟) داکشا و بەیارمەتی و هاوکاری سوارەکانی گۆتتۆ - کورد بێ شەڕوشۆڕ بابلی گرت «٥٣٨ی پ. ز».

ئەم بنەماڵە گۆتتۆییە سەد و بیست و چوار ساڵ[1] و چل ڕۆژ لە ولاتی ئەکەد و بابل حوکمڕانی کرد (لە دەوروبەری ٢٢٦٤ - ٢١٧٣ پ. زدا) بیست و یەک پادشای گۆتتۆ لەو سەدە و چارەکەدا دوا بەدوای یەک هاتن (د).

ئەریدا پیزیر، کە یەکێکە لە پادشاکانی ئەو زنجیرەیە بانگی «پادشای چوارگۆشەی جیهان»ی بۆ خۆی دا. کەچی سەرەڕای ئەم هەموو مەزنی و

---

(١) دەبێ (١٢٧) ساڵ بێ - وەرگێڕ -.

دەبدەبەیە بنەماڵەکە لە لایەن تۆتۆ حیگالی پادشا و دامەزرێنەری چوارەم پشتی ئۆرۆکەوە (ورەکای ئێستا) - کە ئەویش دەوڵەتە شارێکی بەناوبانگی تری سۆمەرییەکانە - رووخێنرا.

لەو باس و هەواڵەدا کە لە نووسراوەکانی سەردەمی سۆمەرییەکانەوە وەرگیراون، شێوەی حوکمڕانی ئەم پادشایەتییەی گۆتۆ - کوردەکان زۆر بەخراپ ناو براوە. وەکو لەو نووسراوانەدا دەردەکەوێ پادشاکانی گۆتۆ، لە پێناوی چەسپاندنی حوکمڕانیی خۆیاندا، شارە تازە بووژاوەکانی سۆمەر و ئەکەدیان داوەتە بەر شاڵاوی تاڵان کردن و سوتاندن و وێران کردن. هەرچی گەنجینەی ناو پەرستگەکانیان هەیە تاڵان کراون، پەیکەری خوداوەند و قەشە ژنەکانیان بردووە بۆ ئەرابخا، بۆیە ئەمان هەموو لاوانەوە و نزاکردن و پاڕانەوەی ناو پەرستگاکانیان بۆ ئەوە تەرخان کردووە کە لە دەستی ئەم حوکمڕانە دڵڕەقانە رزگاریان بێ. چەند شاری گەورە چۆڵ کراون، ژن بەزۆر لە مێردەکانیان زەوت کراون. «شیوەن و گریان و لاوانەوە هەموو سەرزەمینەکەی داگیر کرد، دڕندەی چیاکان، دوژمنی خوداوەندەکان، شارەکانیان وێران کرد و ترس و لەرز و تۆقاندنیان بەهەر چوار لادا سوار کرد» هتد... هەموو مێژووناسە هاوچەرخەکان لەسەر ئەوە یەکن کە سەردەمی حوکمڕانی گۆتۆکان لە سەرزەمینی سۆمەر و ئەکەددا ڕەشترین و بەدترین و دڕندانەترین سەردەمی خۆی بووە[1] «ئەگەر بمانەوێ لەم بارەیەوە داوەرییەکی بابەتەکی بکەین، دەبێ بپرسین ئایا ئەو داوەرییانەی لەم دواییەدا لە بارەی حوکمڕانییەکی ئەوتۆ کۆنی وەکو هی گۆتۆکانەوە کراوە، دوور بووە لە تەئسیری ئەو بیروڕایەی کە گەڕیدەکان لەم سێ سەدەیەی دواییدا لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە بۆ خۆیان دایانڕشتوە؟»

با خۆمان زۆر بەم مەقۆ مەقۆیەوە خەریک نەکەین، هەرچۆنێک بووبێ

---

(١) لێرەدا تەنها باسی یەک سەرچاوە بکەین بەسە. ئەویش بۆ نموونە:
G. Contenau: Manuel d Arcbealogie orientale. Vol. 1 (1928) P. 133, dem: Vol. 11 (1931) P. 701 et passim.

گەلی گۆتۆ بەتایبەتی سەردار و سەرگەورەکانیان بەرەو چیاکان کشانەوە، واتە بەرەو ئەو شوێنەی لێیەوە هاتبوون تا لەوێ سەرلەنوێ بکەونەوە خۆیان و چاوەڕوانی هەل بن. هیچ سەرچاوەی ئەوتۆ بەزنجیر و یەک لە دوای یەکمان بەدەستەوە نییە کە ڕووداوە مێژووییەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک بخەنە ڕوو و سەرگوزەشتەی ولاتی گۆتۆمان پێ نیشان دەن. بێ جێیە گەر بڵێین گۆتۆکان ئیتر دوای ئەوە کڕبوون و لە هێرش کەوتن بۆ سەر شار و پێدەشتەکان چ لە سەردەمی سۆمەرییەکان چ لە سەردەمی یەکەم بنەماڵەی بابلییەکاندا...

ڕاستییەکەی چەندین خشتی ئەستێرەناسی، یان دەقی ئاینی پاشماوەی ئەو سەردەمە لە زۆر جێگادا باسی ئەو مەترسییە دەکەن کە بەردەوام بەرەنگاری ئەکەد و بابل بووە، لە پێشبینییەکدا کە بەداخەوە مێژووەکەی نادیارە، نووسراوە کەوا «چەکی گۆتۆکان ولاتی بابل وێران دەکا»[(١)] لە کاتێکدا لە گەلێ خشتی ئەستێرەناسییدا چارەنووسی ولاتی گۆتۆ بەم جۆرەی خوارەوە پێشبینی کراوە: «ڕووخانی ولاتی گۆتۆ بەچەک دێتە دی، سەرزەمینی ئەکەد سێساڵ سەرزەمینە دوژمنەکانی گۆتۆ و ئیلام دەخاتە ژێر پێی خۆیەوە»...

ئەم دەقانە بەڕوونی باسی پەیوەندییەکانی نێوان پادشانشینی بابلییەکان لە دەشتەکاندا و هی گۆتۆکان لە چیاکاندا دەکەن وا دوور دەکەوێ،

---

(١) آ. اونگناد. سوبارتو ل ٨٧: وشەی (کاکو) لە زمانی بابلییدا بەرانبەر وشەی «چەک» دێ لە زمانی هاوچەرخی کوردییدا. لە زمانی ئەرمەنی کۆن و تازەدا «زەنک» بەکارهێنراوە. بەباشی دیارە هەرسێ وشەکە لە یەک سەرچاوەوە هاتوون، چ لە باری مێژووییەوە چ لە باری ڕەگەزییەوە گران دێتە ئەقڵەوە کە زمانی کوردی یان ئەرمەنی وشەیەکی ئاوها پێویست و زۆر بەکارهێنراو لە بابلی یان ئەکەدییەوە وەربگرن. ئەبێ ڕەچەڵەکی ئەم وشەیە لە زمانی «خوری»دا کە کۆنترین زمانی بەکارهێنراوی دانیشتوانی ئەرمەنستان و کوردستان و ئەو دەورووبەرە پەیجووری بکرێ.

حامورابی یاسا دانەر، بەدرێژەی چل ساڵی[1] حوکمڕانییە سەرکەوتووانە و ئاسوودەکەی، توانیوبەتی گۆتۆکان لە چیاکاندا بەربەست بکا و نەهێڵێ ئێمنایەتی و خۆشگوزەرانی لێ تێک بدەن. ڕاستە پادشاکانی یەکەم بنەماڵەی بابلییەکان جۆگە و پەرستگای گەورە گەورەیان دروست کردووە بەڵام لە ڕووی تواناداریی سوپاییەوە، بەگرانی توانیویانە وڵاتەکەیان لە چەپۆک و هێرشی چیاوچۆڵ نشینەکانی دەوروبەریان بپارێزن...

(١) (١٧٩٣ - ١٧٥٠ پ. ز) چ سیدنی سمیث چ زانایانی تر ئەم مێژووەیان لا تەواوە.

## کاشییەکان بابل ڕادەماڵن

کەمێک دوای مردنی حامورابی و لە ساڵی هەشتەمی حوکمڕانی شامشور ئیللۆنای کوڕیدا، کاشییەکان هێرشیان بردە سەر سەرزەمینی بابل و شارە دەوڵەمەندەکانی ناو پێدەشتەکانیان تالان کرد و گەڕانەوە بۆ هەڵەتەکانی خۆیان، ئەوەی کە سەرنج ڕاکێشە، ئەوەیە تالانکەری ئەم جارە دانیشتوانی وڵاتی گۆتۆ نەبوون، بەڵکو گەلێکی تازە بوون کە بەکاشی ناو دەبران ئەم کاشییانە خێڵێک یان کۆمەڵە خێڵێک بوون کە لە بڵندایییەکانی زاگرۆسدا، واتە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی بابل، لەوانەشە لە ژووررووی وڵاتی ئیلام، دەژیان، لە بارەی ئەوەوە کە کێن و کوێندەرێن، زانایان و مێژووناسان لەسەر یەک بیرورا نین. وای پێ دەچێ، هەمان خێڵە کوردەکانی لوڕستان بن کە لە زنجیرە چیای زاگرۆسی ڕۆژئاوای خوارووی ئێراندا نیشتەجێن.

ناوەکەیان، کاشوو لەوانەیە بچێتەوە سەر ناوچەی خوزستان (ئێران). ئەمان میللەتێکی هیندۆ ئەورووپی بوون و چ لە باری ڕەگەزەوە چ لە باری جوگرافیاوە لە گۆتۆکان نزیک بوون (هـ). حوکمفەرمایی پادشا کاشییەکان لە سەرزەمینی بابلدا نزیکەی چوار سەدەی خایاند. ئەم بنەماڵە بێگانەیە بەسێیەم پشتی بنەماڵەی پادشایی وڵاتی بابل دەژمێررێ. تا نزیکەی سیی ساڵ لەمەوبەر ئەو زانیارییەی دەربارەی ئەم بنەماڵەیە هەبوو، کەم و پچڕ پچڕ بوو و حوکمڕانیی کاشییەکان لە بابلدا بەدڕندەتر و بێ بەزەییانەتر لە هی گۆتۆکان لە سەرزەمینی ئەکەددا دادەنرا. بەڵام ئەو بەڵگانەی کە پاش پشکنین و پەیجوورییەکانی ئەم دواییییە کەوتنە دەست و ئەو ئامرازە مەعدەنییانەی لە شوێنەوارەکاندا دۆزرانەوە ئەم بۆچوونەیان لە بارەی کاشییەکانەوە لە بنەڕەتەوە هەڵوەشاندەوە. ئێستا دەردەکەوێ کەوا خاوەنی خوداوەندی تایبەتیی خۆیان بوونە. خوداوەندە گەورەکانیان هەریەکەیان ناوی تایبەتیی خۆی هەبووە وەکو کاشوو، خاربە، سوریاش، شیباک،

خود[١]، شیمالیا - کە خاتوونی کەژە ئالەکان بووە و بەلوتکەکانی ئەم کەژانەوە ژیانی بردۆتە سەر و گەلێکی تر.

ژمارەیەکی زۆری کەرەستە و تفاقی جوانی لە تووج دروستکراو، کە برێتین لە پەیکەری خوداوەندەکان، شەخسیەتە ئەفسانەییەکان، هەندێ زیندەوەر و ئەسپ بەسەرکەلە و هەوسارەوە، کە لە لورستان دۆزراونەتەوە بەهی سەردەمی کاشییەکان دادەنرێن.

پادشاکانی کاشییەکان داب و نەریت و هەستی ئایینی خەلکی سەرزەمینی بابلیان نەخستبووە پشتگوێ. «گانداش»ی یەکەم پادشایان کە سەرزەمینی بابلی لە شەڕدا بەزاند (دەوروبەری ١٦٠٠ی پ. ز)، ناوی «پادشای هەر چوار چمکی زەوی و پادشای بابلی» لە خۆی نا. یەکێک لەو نووسینانەی کە بەزمانی بابلی نووسیویانیەتی بۆ یادکردنەوەی وەرگرتنەوەی پەرستگای ئەنلیلی خوداوەندی بابلییەکان تەرخان کراوە... وەکو دەردەکەوێ ئەو زۆر بەتەنگەوە بووە باج و خەراجی پەرستگا بابلییەکان بەرێکوپێکی و وردی کۆبکرێتەوە. پادشایەکی تری کاشییەکان، واتە ئاگۆمی دووەم، ناوی پادشای سەرزەمینی گۆتۆ و گەلێ ولاتی تری بۆ خۆی جاڕ دا... ئەمە لەوانەیە ئەوە بگەیەنێ کەوا بنەمالەی کاشییەکان سەریان بەپادشایەتی دێرینەی گۆتۆ دانەواندبێ. بەدرێژەی مێژووی دووردرێژی گەلی کورد، چەند جار ڕوویداوە خێلێکی گەورە و دەسەلاتدار - هەرکە هەلی بۆ ڕەخسا بێ هەلساوە خێلێکی تری لە خۆی ژوورتری بەزاندووە و دەسەلاتی لێ زەوت کردووە و بالی سەرگەورەیی بەسەر هەموو ولاتەکەدا بەزۆر کێشاوە.

کە دەسەلاتی کاشییەکان بەسەر سەرزەمینی بابلدا (یان کاردۆنیاش - وەکو لە بەلگە و دۆکۆمێنتەکانی ئەم سەردەمەدا پێی دەوترێ خەریک بوو

---

(١) (خود) یان (خودا) لە زمانی فارسیدا (God)ی ئینگلیزی دەگرێتەوە، ئاشکرایە کە فارسی لە زمانێکی ترەوە وەریگرتووە. تا ئێستا نەزانراوە ئایا (خود)یش یەکێک بووە لە خوداوەندەکانی ئیلام و سەرزەمینی گۆتۆ یان نا.

بێتە كۆتایی، پادشاكانی ئەم دواییەی كەوتنە دروستكردنی پەیوەندی چاك و پتەو لەگەڵ هێزە دەست ڕۆیشتووەكانی میسر و حیثییەكان و سەرزەمینی تازەپێگەیشتووی ئاشوورییەكاندا (سەدەكانی ١٥ و ١٤ پ. ز). ژن و ژنخوازی كەوتە نێوان بنەماڵە پادشاییەكانی كاردۆنیاش و میسرەوە و كاداشمان - ئەنلیلی پادشای كاشی هەمیشە داوای دیاری و خەڵاتی زێڕی لە پادشای میسر دەكرد... ئەم سەردەمی ژێر دەستەییەی سەرزەمینی بابل لە لایەن كاشییەكانەوە، كەمتر ژیانی گەلی كورد دەگرێتەوە چونكە لەو كاتەدا كاشییەكان لە كاشییەتی دەرچووبوون و بووبوون بەبابلی...

## کوردستان و سەرزەمینی ئاشووریان

## (دەوروبەری ١٣٦٠ - ٦٠٦ پ. ز)

تا ئەم سەردەمە سەرزەمینی گۆتۆ و کاشییەکان پەیوەندی و سەروساختیان هەر لەگەڵ ئەو دەوڵەت و گەلانەدا هەبوو کە نەختێک لە خۆیان بەدەسەڵات و هێزتر بوون بۆیە هەر جار ناجارە دەیانتوانی بانگی سەربەخۆیی تەواوی خۆیان بەبڵندی بدەن و هەر کە هەل بڕەخسایە هەڵمەتیان دەبرد بۆ پێدەشتەکانی لای ڕۆژئاوا و دەستیان بەسەردا دەگرت. بەڵام کە دەوڵەتی ئاشووری سەری هەڵدا، بارودۆخی گشتی نەک تەنها دەوروبەری دیجلە و فورات بەتەنها، بەڵکو هی هەموو ڕۆژهەڵاتی کۆن کەوتە هەژان و گۆڕانی بنەڕەتی بەجۆرێک کە لە سەرەنجامدا بەزیانی هەموو وڵاتە دراوسێکان تەواو بوو. ئەمە نەک هەر لەبەر ئەوەی سەرزەمینی ئاشوور چ لە لەشکر یان دارایی و ئابووریدا، چ لە تەکنیک و توانای تردا لە خەڵکی تر ژوور دەستتر بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە وەکو «هێزێکی گەورە هاتە مەیدانەوە» بەتواناییەکەوە کە لەگەڵ شان و باڵییدا بەراورد نەدەکرا. بەتوانایی دەوڵەتی ئاشوورییەکان هی ئەوە بوو کە کەوتبووە سەر ئەو سێکوچکە بچووکەی کە لە کۆنە شاری ئاشوور و نەینەوا و هەولێر پێکهاتبوو و لەسەر ڕۆخەکانی دیجلەوە دەستی پێ دەکرد تا دەچووە ناو دەشتە کاکی بەکاکییەکانی دەوروبەرییەوە. بێ دەسەڵاتی توند و قایمی ناو دەستی پادشا و میرە زەبەردەست و مشت توندەکانی، وڵاتی ئاشوور هەرگیز نەیدەتوانی بگاتە ئەو دەسەڵات و توانا سەربازییەی کە لە ماوەی حەوت سەدەی حوکمڕانییدا، جار جار بۆ ماوەی کورت و جاری تر بۆ ماوەی دوورودرێژ، لە کاردا بوو.

ئاشوور ئۆبالیتی یەکەم (١٣٦٢ - ١٣٢٧ پ. ز) کە بەدامەزرێنەر و پێگەیەنەری هەیبەت و شکۆی دەوڵەتی ئاشووری دادەنرێ، سروودی جەنگی خۆی لەو نووسراوەدا داڕشتووە کە لەم دواییەدا تاقمێکی پشکنین

و منەکاری سەر بەمۆزەخانەی بەریتانیا[1] دۆزیویەتەوە. بەپێی ئەو نووسراوە ئەو لە هێرشەکەیدا بۆ سەر ولاتی کاشی و کوردەکان داوا لە سەربازەکانی دەکا کە ئەم سروودەی خوارەوە لەبەرکەن و لە مەیدانی کارزاردا بەدەنگی بەرز بیلێن:

کوڕینە، شێرانە هەلمەت بەرنە سەر پادشای کاشی
چاوەڕێی ئەوە مەکەن حوکمەکەی خۆی هەرەس بێنێ
بەر لە کاتی خۆی کۆتایی پێ بێنن...
ئەو هێزانە تارومار کەن، کە ناوی خۆیان ناوە قارەمان!
هۆ بابە... لەم تەنگانەیە دەرمان کە! ئەو کەسەی بەتەمای لەناوبردەنمانە
پەیتا پەیتا خەریکی کاری ئەهریمەنانەیە...
پەیتا پەیتا خەریکی پیلانە تا سەرزەمینی گۆتۆ وێران کا
پەنجەی هەڕەشەی درێژ کردووە و دەلێ: نەمێنی!
دوا بەدوای خوداوەندەکان و یارمەتیدەرەکان
پادشا، لە پێشەنگی سوپاوە، هاواری کرد
منم ئاشوور - ئۆبالیت، قارەمانی دەست وەشێن خۆمم،
سەرکردەکانیان هەپروون بەهەپروون کەن.

بەم قسەیە شەڕەکەی دەست پێ کرد جەنگاوەرانی ئاشوور، هەموو تامەزرۆی جەنگ، ڕووبەڕووی مەرگ وەستابوونەوە نەڕاندیان «ئیشتار - تا کەی ئەمانە هەر دەبنە مایەی سەریەشە و خەم بۆ خانمی خوداوەندمان».

بەدرێژایی پتر لە سەدەیەک (١٣٦٢ - ١٢٤٢ پ. ز) پێنج پادشای مەزنی ئاشوورییەکان ناچار بوون پەیتا پەیتا دژ بەکاشییەکان هەر لە جەنگدا بن، چونکە کاشییەکان هەمیشە مایەی مەترسی بەردەوام بوون

(1) Sir. Campbell Thompson and R. C. Hutchinson: In Arcbaeoiqia. Vol. Lxxix (1929). P. 132. Lines 13 - 33.

ئەمڕۆ، واتە دوای سی و سێ سەدە، گەلی کورد هەمان سروودی دژ بەتورکەکانی لەسەر زارە.

لەسەر حوکمفەرمایی ئەوان بەسەر ئەمبەر و ئەوبەری ڕووباری دیجلەدا تا گەیشتە سەردەمی پادشا ئۆکۆلتی ننیۆرتای یەکەم (١٢٤٢ - ١٢٠٦ پ. ز) کە لە ساڵی چوونە سەر تەختیدا، توانی گۆتۆکان و هەموو وڵاتی بابل تا دەگاتە نۆکەندی عەرەب[١] بەزێنێ. لە جەنگێکی گراندا لەسەر ڕۆخی لای چەپی ڕووباری دیجلە ڕوویدا، ئەم پادشا ئاشووریە بەتەواوی لەشکرەکانی کاشییەکانی تەفروتونا کرد و کاشتیلیا شووی دووەمی پادشایانی بەدیل گرت.

لە نووسراوەکانیدا، ئۆکۆلتی - نینۆرتای یەکەم، ناوی چەند جێگایەکی سەر بەسەرزەمینی گۆتۆ و کاشوو دەبا، کە بەهۆیانەوە دەتوانین، تا ڕادەیەک، سەرزەمینی ڕاستەقینەی گەلی کورد لە چوارچێوەی هەردوو سەرزەمینی گۆتۆ و کاشوودا دەستنیشان بکەین. ئەم پادشایەی ئاشووریان دەڵێ بەسەرکردەیی لەشکرەکەی بەرەو «چیا سەرکەشەکانی تول - سینای نێوان شارەکانی ساسیلا و مەشخەتشاری ئەو لای زێی بچووک پێش کەوتووە هەروەها لە سەرزەمینی زوکوشکی و لارلارەوە تا سنوورەکانی سەرزەمینی پان و بەرینی گۆتۆ» ملی ناوە (و).

ئەگەرچی کاشتیلیا شووی دووەم، تووشی شکستێکی یەکجار گەورە هات، بەڵام سەرزەمینی کاشی پتر لە سەدەیەک دوای ئەوە هەر بەسەربەخۆیی مایەوە، سەرزەمینی بابل کە تا ئەو کاتە ژێردەستەی کاشییەکان بوو ڕاپەڕی و ئازادی خۆی وەدەست هێنایەوە. هەر لە دەوروبەری ئەو سەردەمەدا، پادشایەتی ئیلامیش وریا بووەوە و دەستی بەژیانێکی سەرلەنوێ کرد. بەم جۆرە کوردستان (گۆتۆ و کاشو) لە هەر چوار لاوە لە لایەن ئاشووریەکان و بابلییەکان و ئیلامییەکانەوە دەورەگیر کرا و ئەستێرەی کەوتەوە نەهامەت و بێوڵەتی (ز).

لە ساڵی سێیەمی حوکمفەرماییدا (٨٨١ پ. ز) ئاشوور ناسر پاڵی

---

(١) لە دەقە ئینگلیزییەکەدا «نۆکەندی فارس»، ئەمە لە چەند جێی تری کتێبەکەدا هەروا نووسراوە - وەرگێڕ -.

دووەم، کـە دەتوانرێ بەخـوێنڕێژترین پادشـای ئاشـوورییـەکـان دابنرێ، هێرشێکی یەکجار سەختی بردە سەر هەموو سەرزەمینی کوردستان. نور ئەدادی شازادەی قەڵای داگارا بەپەیمانداری و هاوکاری زۆربەی خێڵەکانی وڵاتی زاموا (گۆتۆ) لە پێشکەشکردنی باج و خەراجی ساڵانە سەرپێچی کردبوو. گەر باج و خەراج لە کات و ساتی خۆیدا نەگەیشتایە، پادشاکانی ئاشوور «وەکو شێر دەیاننەڕاند» یان «وەکو یەکانەی کێوی هەڵمەتیان دەدا»، ئاشـوور نـاسـر پالی دووەم لەشکری بەرەو دەربەندی بابێت (ح) کێشا. خێڵەکان بەسەرکردەیی نور ئەداد گەرووی دەربەندەکەیان دیواربەست کرد، تا بەر لە پێشکەوتنی پادشای ئاشوور بگرن. کە پەی بەم تەگبیرە برد و زانی ناتوانێ لەوێوە تێـپـەڕ بێ پادشای ئاشوور ناچار بەرەو ڕۆژئاوای باکور بای دایەوە و هێرشی بردە سەر خێڵەکانی چیای جوودی (کێنیپا – نیـسـیـر) و هەشت قـەڵایچـەی تاڵان کـرد و ئاگـری تێ بەردان، ئینجا پەلاماری قـەڵای مـەزنی لاریوسـای دا، کە تێـیـدا کـیـرتیـارای (کورد؟) فەرماندەی قەڵاکە نائومێدانە بەرگری دەکرد. لە سەرەنجامەکە وا دێتە دی کەوا چ زاموا و چ لۆلۆم، هەردوو سەریان دانەواندبێ و باج و خەراجەکەی سەریان دابێ. چەندین داگـیـرکاریی تری سـەرزەمـینی دەوروبەری زنجیـرە چیـای زاگرۆسی کـوردان بەم جۆرە لە لایەن پادشـاکـانی ئاشـوورییـەکـانەوە شەڵمان نەسری سێیەم (٨٥٨ – ٨٢٤ پ. ز)، شامشی ئەدادی پێنجەم (٨٢١ – ٨١٠ پ. ز) ئیگلات پیلاسەری سێیەم (٧٤٧ – ٧٢٨ پ. ز) سـەرگۆنی سـێـیـەم (٧٢٢ – ٧٠٥ پ. ز) ئەسـەرحـەدوون (٦٨٩ – ٦٦٨ پ. ز) و هی ترەوە باس کـراوە. لەگـەڵ ئەمـەشـدا گـەلی کـورد بەدرێژایی ژیانی هەرگـیـز سـەری نەوی نەکـرد و، سـەرزەمـیـنی گـۆتۆش، ئەگـەرچی نووسـراوەکـان بەناوی «گـۆتۆ»وە ناویان نەبردووە بەڵکو بەناوی مـیـدیاوە یادداشـتـیـان کـردووە، ڕۆڵێکی گـەورەی بینی لە هەرەس پێ هێنان و تەفـروتونا کـردنەکـەی سـاڵی ٦١٢ی پ. ز ی ئیـمـپـراتۆریی ئاشـووریدا (ط).

## سەرهەڵدانی وڵاتی فارس و سەرزەمینی گۆتۆ - کوردستان

## (٥٣٨ پ. ز - ٦٤٠ پ. ز)

لەسەر خشتە بەردینەیەک کە لە وێرانەکانی بابلدا دۆزراوەتەوە، نووسراوە کەوا کۆرشی دامەزرێنەر و یەکەم پادشای بنەماڵەی هەخامەنشی فارس (٥٣٨ - ٥٢٩ی پ. ز) بەشانازییەوە دەڵێ کەوا مەردووخی خواوەندی شاری بابل «خێڵەکانی سەرزەمینی گۆتۆی ناچار کرد لەبەر پێی ئەودا کڕنووش بەرن». ئەم قسانە زۆر بەگرانی دەچنە ئەقڵەوە، ئەمەش لەبەر هۆیەکی یەکجار ساکار: دەوڵەتی فارس کە خۆی تازە لە ناوچە لماوییەکانی نۆکەندی فارسەوە بووبوو بەقەوارەیەکی سیاسی، کەی ئەو هێز و توانایەی هەبوو کە گەلێکی بەیدەستی وەکو گۆتۆ بێنێتە کڕنووش. بەپێچەوانەوە، هەر بەگوێرەی ئەو نووسراوەی کۆرش خۆی، ئەو کەسەی کە هەوەڵ جار بەخۆی و سوارە کوردەکانییەوە چووە ناو شاری بابلەوە ئۆگبارۆی[1] پادشای گۆتۆ بوو و تەنها چەند ڕۆژێک دوای ئەوە ئینجا کۆرش چووە شارەکەوە و بێ شەڕ و پێکدادان گرتی. ئەمەش وەکو هەر ئێستا لە سەرەوە باسمان کرد وە نەبێ یەکەم جار بێ گۆتۆ بابل ببەزێنێ؛ لە پاداشی ئەم خزمەتگوزاریەدا کە کردی، ئۆگبارۆ کرا بە«حوکمداری شا» و دوای ئەوە بە«جێگری پادشا بەسەر ئەوبەری ڕووباردا» واتە ئەوبەری فورات کە سوریا و فەلەستین دەگرێتەوە. ڕاستییەکەی هیچ تۆمارێکی تەواومان بەدەستەوە نییە باسی تەنانەت یەکێک لە پادشاکانی گۆتۆ بکا و، ئەو شاکار و کردارانەش کە کردوویانن مەگەر بەدەگمەن لە لایەن خەڵکی ترەوە، ئەگینا هەرگیز باس نەکراون، خۆ دوژمنەکانیان هەر هەوڵی لە نرخ شکاندنیان داوە. ئەگەر لە ئۆگبارۆ (یان گۆبارۆ)ی پادشای گۆتۆوە

---

(1) Sidney Smith: Babylonian Historical Texts (1924) and O. Ieuze: Die Satrapien - einteilung in Syrien und Meso Potamien.

هیرۆدۆتس هەوڵی داوە گۆبارۆ بکا بەفارس. هەروەها ئەسپاتینی ئەرمەنی و ماردۆنیاسی مانییش دەکا بەکوڕی گۆبارۆ، واتە ئەوانیش فارسن!.

نووسراوێک بمایەتەوە، بێ هیچ گومانێک باس و خواسەکەی بەپێچەوانەی ئەوەی کۆرشە بۆ دەگێڕاینەوە. ئۆگبارۆیەکی تر جا ئایا هەمان پادشا خۆی بێ یان کوڕی، دەورێکی یەکجار گەورەی لە سەرکەوتنی دارای مەزندا بینی...

دیارە ئۆگبارۆی پادشای گۆتۆ بەباشی پەی بەو زیانە مەزنە نەبردووە کە بەیارمەتیدانی کۆرش لە تەفروتونا کردنی پادشایەتی سەربەخۆی بابلدا بەرۆژهەلاتی پڕ لە شارستانی گەیاندووە. کۆتایی هێنان بەو بنەماڵە بابلییە تازە لەسەر تەخت چەسپیوە (٥٨٨ پ. ز) وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە مێژووی جیهاندا ئەویش لەبەر ئەم دوو هۆیەی خوارەوە:

١) تا جڵەوی کاربەدەستی پادشایەتییە کۆنە پشت بەدوای پشتدا هاتووەکانی رۆژهەلاتی دێرین (ئاشوورییەکان، ئۆرارتو - ئەرمەنستان، بابلییەکان بەگۆتۆشەوە) بوو، هەمیشە بەرانبەر بەهەر دزەکردنێک یان سنوور بەزاندنێک کە لە دەم دەریای سپی ناوەڕاستەوە و لە رۆژئاوای ئاسیای گچکەوە کرابێ لەسەر پێ بوون و بەم جۆرە پاکیزەیی و سایشتی خۆپارێزانەی رۆژهەلاتی ڕاستەقینەیان دەپاراست، بەڵام هەر لەو ساتەوە کە ئەمان هاتنە مەیدانەوە و لەبەر دنیا نەدیتەیی و کەمی تاقیکردنەوە و کزی هەستی نیشتمانیی و نەبوونی رۆشنبیری و شارستانییەت و بوونی نەتەوەیی، فارسەکان دەرگایان لەسەر پشت بۆ یۆنانییەکان و خەڵکانی هەمە چیزەی تر کردەوە تا بێنە ناوە و بەڕاوێژکاری یان رێنومایییکاری لە کاروباری سیاسەتی ئیمپراتۆریەتەکەدا کار بکەن لە کاتێکدا دەبوو رۆژهەلاتییەکان خۆیان ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆ بۆیە پادشایەتی هەخامەنشی بەدرێژەی ماوەی حوکمڕانی هەر لاواز و بێ دەسەڵات بوو، تەنانەت نەیتوانی بەرەنگارکارییەکی باش و کاریگەر بۆ وەدەرنانی ئەو چەند هەزار سەرەڕۆیە بکا کە دوای ئەسکەندەری گەورە کەوتبوون و گەر (شاهی شاهان) لە ساڵی ٣٥٥ - ٣٢٥ی پ. زدا ئاشوورییەک، ئەرمەنییەک یان گۆتۆیەک بووایە، لەوانە بوو ئەسکەندەر هەرگیز

نەیتوانیایە پێ بنێتە ئەمبەری فوراتەوە، تەنانەت گەر بۆ قسە بەزۆراندان فەرز کەین بشیتوانیایە، ئەوا هەر زوو بەزوو تا دەریای ئیجە کەڵەگا ڕفێن ڕاو دەنرایەوە...

ب) ناساندنی یۆنانییە «ئازادی دۆست» و «بیر بەکارهێنەر»ەکان بەکۆمەڵگا مێشک ساکار و گەوهەر پاک و ڕەسەن چاک و بێ خەوشەکانی ڕۆژهەڵاتی دێرین، بەرە بەرە ئاڵوگۆڕکاری و پێشکەوتنی ڕاستەقینەی مێژوویی هەرێمەکەی هەژاند. لە ماوەی هەزار ساڵێکدا دوای ئەوە، داستان و ئەفسانە بەندی یۆنانی، ڕووی ڕاستەقینەی شارستانییەتی دێرینەی ڕۆژهەڵاتی لێڵ و لەکەدار کرد. ڕەگەزە هەرە کۆن و ڕەسەنەکانی وەکو عەرەب و ئاشووری و گۆتۆ و ئەرمەنییەکان، خۆیان زۆر نەشێوان. بەڵام مێژووی کۆنیان بەتەواوی شێوێنرا، گەلێ چیرۆکی سەیر سەیر، یان ڕووداوی شەرماوەر لە لایەن هیرۆدۆتسەوە دەربارەی حشیەکان و مادەکان، یان نەتەوەی نەناسراوی ترەوە گێڕراوەتەوە، بەڵام هەرگیز شتێکی ئەوتۆ کە تەنها تۆزقاڵێک نرخی هەبێ دەربارەی ڕەگەزە خۆڵاتییەکان نەوتراوە و تەنانەت لە دووریشەوە شتێک بۆ گۆتۆکان هەڵنەبەستراوە (ی).

هیرۆدۆتس لە چەندین جێگا باسی سەرزەمینی سیسیا دەکا کە بەناوونیشان کاشووی دێرین دەگرێتەوە، واتە سەرزەمینی کاشییەکان و ئاماژەیەکیش بۆ پاکتییەکانی سەر سنووری هیندییەکان دەکا و دەری دەخا کەوا لە ناو سوپای سیریکیسدا، کە گوایە ڕۆژگارێک یونانستانی داگیر کردووە. سەربازی سەر بەخێڵی بوختی هەبوونە و گوایە هەندێ پاکتیشیان لە نێواندا بووە کە کەوڵی بزنیان لەبەرخۆ هەڵکێشاوە و خەنجەر و تیروکەوانی تایبەتی و خۆڵاتی خۆیان هەبووە (٧ - ٦٧). گەر بشێ پشت بەم گێڕانەوەیە ببەسترێ و بەڕاست دابنرێ، دەبێ بڵاوبوونەوەی خێڵە کوردەکان تا سەر سنووری هیندستان لە سەردەمی دارای مەزنەوە دەستی پێ کردبێ. ئەم مێژوونـاسە یۆنانییە هەندێ زانستی تر دەربارەی خێڵی شکاک دەداتە دەستەوە: «دووەم خێڵێکی کۆچەر هەیە کە بەساگارتیان ناو

دەبڕێن (ک) و بەزمانی فارسی دەئاخاون و جلوبەرگێک لەبەر دەکەن کە لە نێوان هی فارسەکان و هی پاکتییەکاندایە. ئەمان هەشت هەزار سواریان دابووە لەشکرەکە، بەڵام هۆکارەکەی هەڵگرتنی چەکی لە تووچ دروستکراو یان لە پۆڵا دروستکراو نەبوون. جگە لە خەنجەر، وەستایانە جۆرە کەمەندێک بەکار دێنن کە لیسپەکانیان لە مەچیر دروست کراوە و هەموو بەم چەکەوە ئامادە و تەیار دەچنە مەیدانی جەنگەوە شێوەی شەڕکردنیشیان بەم جۆرەیە: کە لە دوژمنەکەیان نزیک دەبنەوە، کەمەندەکەیانی بۆ هەڵدەدەن ئیتر هەرچییەک تێ کەوێ چ ئەسپ چ زەلام، ڕووەو خۆیان بکێشێ دەکەن. هەر کەسێک کەوتە ناو کەمەندەکەوە ئیتر ڕزگاربوونی نییە چونکە یەکسەر سەر دەبڕێ، یان بەدوای لەشکری فارسەکانەوە بکێش دەکرێ (٧ - ٨٥). سەدە و نیوێک دوای ئەوە، تەنها ڕێکەوتێک دەبێتە مایەی دەرکەوتنی خێڵە کوردەکان لەسەر شانۆی نێو دەوڵەتی. زینۆفۆن خۆی و دە هەزار پیاوەکەی بەکوردستاندا بەرەو دەریای ڕەش دەکشانەوە (٤٠١ - ٤٠٠ پ. ز). لە نێوان وڵاتی بابل و کاردۆخستان (کوردستان)دا.[1]

زینۆفۆن باسی ئەو میدیاییانە دەکا کە لەوەبەر دانیشتووی شارێکی گەورە بوونە و دوایی کۆچیان لێی کردووە[2].

بەڵام ئەوەی زۆرتر سەرنجی ئەمی کێشاوە ئەو کۆمەڵە خەڵکە بوون کە بە«حیثی بەناوبانگ بوون و لەو هەرگیز تیروکەوانەکانیان لە دەست

(١) وشەی کۆنی کاردۆخستان، کوردۆخی کۆنی ئەرمەنستان، واتە هەرێمی ڕۆژهەڵاتی باشووری ئەرمەنستانی گەورە کە زۆر جار لە کتێبە کۆنەکانی یۆنانی و ڕۆمەکاندا باسیان لێ کراوە. هەرێمی کوردۆخ یان کورجۆیخ لە دە ناوچە پێکهاتووە کە تێیاندا کوردۆخی ژوور و ناوەڕاست و خواروو بێ زیاد و کەم ناوچەی «بۆهتان»ی ئێستا دەگرنەوە، ئەو سەرزەمینەی لە سەردەمەکانی دێریندا بە«بابخی» دەناسرا.

(2) Xenophon: Anabasis 111. 4. 10.

نەدەکەوتە خوارەوە و پەیتا پەیتا خەریکی تیر وەشاندن بوون». ئەو، واتە زینۆفۆن، هەرچی دەڵێ با بیڵێ، بەڵام گومان لەو ڕاستییەدا هەرگیز نییە کە لەو سەردەمەدا نە حیشی لە ناوچەکەدا هەبووە و نە میدیایی هەر لەو کاتەشدا کە دە هەزار کەسە کە بەگرد و تەپۆلکەکانی بەر چیای حەمریندا ملیان نا، جگە لە خێڵەکانی گۆتۆ کەسی تر لەو ناوە هەر نەبووە و ئەم حیشی و میدیاییانە کە لە نووسراوەکانی یۆنانییەکاندا باس کراون، لە گۆتۆکان بەولاوە کەسی تر نەبوون.

ئەو باس و گێڕانەوەیەی زینۆفۆن لە بارەی گەلی کاردۆخەوە پێشکەشیان دەکا، چ لە بارەی داب و نەریتیانەوە بێ یان شێوە و شێوازی شەڕکردنیان یان ڕەفتاری گشتییان لەگەڵ بێگانەدا، دەقاودەق ڕاست و بێ سەربارن و هەتا دووەم نیوەی سەدەی پێشوو هەروا بوون، کاردۆخییەکان کە بانگ دەکران نە هاوڕیان دەدایەوە نە هیچ هەستێکی دۆستانەیان نیشان دەدا «هەندێکیان بەکۆمەڵ هێرشیان بردە سەر پاشەڵی لەشکری یۆنانییەکان و چەند کەسیان لێ بەپەڵە بەرد و تیر کوشت و بریندار کرد. ئەوان، تەنها چەند کەسێک بوون و یۆنانییەکان لەناکاوێکدا هاتبوون بەسەریاندا، گەر بهاتایە و ژمارەیان لەوە پتر بایە، گومان لەوەدا نەبوو کە لەشکری یۆنانییەکان دەکەوتە بەر مەترسی تەفرۆتونا بوونی تەواو». «بەشەوان کاردۆخییەکان لەسەر هەر گردە و ئاگرێکیان دەکردەوە و چاوەدێری سپیرەکانی یەکتریان دەکرد» «دوژمن بەتوندی تەنگی بەیۆنانییەکان هەڵچنی و لە گەروو تەنگەبەرەکاندا لێیان هەڵدەبەزینەوە و بەتیر و قۆچەکانی تێیان بەردەبوون... بەری خۆ بدەنە ئەم چیایانەی کاردۆخییەکان و بزانن چەند سەخت و سەرکەشن. ئەو تاقە ڕێیەی کە دەیبینن تا بلێی هەوراز و تووشە و بەمبەر و ئەوبەریەوە سەدەها زەلام خۆیان مات داوە و چاوەڕوانی نێچیرن»...

«دوای ئەم سەرکەوتنە، کاردۆخییەکان لە بڵنداییەکەوە کە بەدەستی ئەوبەری سێیەم تەپۆلکەوە بوو دەرکەوتن و زینۆفۆن بەهۆی دیلمانێکەوە

لەسەر ڕاوەستاندنی شەڕ و دانەوەی لاشەی کوژراوەکان لەگەڵیاندا کەوتە گفتوگۆوە... ئەوان لە وەڵامدا وتیان کەوا ئامادەن کوژراوەکان بدەنەوە، بەمەرجێ ئەمانیش دەست لە سووتاندنی ئاواییەکانیان هەڵگرن»... «کاردۆخییەکان وەکو مێروولە لە هەر کون و کەلەبەر و شیو و دۆڵێکەوە شریتەیان کرد و کردیان بەزەڵە و هاتوهاوار و بەرد گلێرکردنەوە تا پێی یەکێکیان لە زەلامەکانمان شکاند» هتد... گومان لەوەدا نییە کەوا کوردەکان درێغییان بەیۆنانییەکان نەکردووە، چونکە ئەمان گوند و ئاواییەکانیان سووتاندووە و ئازووقە و خواردنیان بەزۆر بردووە و پیاوەکانیان بەدیل گرتووە.

وێ دەچێ بلاوبوونەوەی خێڵە کوردەکان یەکجارەکی لە سەردەمی حوکمڕانیی بنەماڵەی سلووقییەکاندا لە سوریا پەرەی سەندبێ، چونکە سلووقییەکانیش هەر وەکو پادشا ساسانییەکانی ئەم دواییەی ئێران، لە پشتێک یان دووان بەولاوە حوکمڕانییان نەدەکرد گەر بەپشتگیری بێ پول و پارەی گەلانی وەکو کورد نەبووایە کە بەنەریت شەڕکەر و جوامێر و هەمیشە ئامادەبوون بچنە ڕیزی ئەو سوپایانەوە کە بۆ پاراستنی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی باکور و باشووری سەرزەمینی فارس پێک دەهێنرا...

## ئەرمەنستان و پارتستان و خێڵە کوردەکان

تۆمار یان ئەدەبیاتێکی نیشتمانیی پارتی ئەوتۆ بەدەستەوە نین کە باسیان بکرێ. سەرچاوەی مێژووی پارثییەکان تا ئێستا هەر نووسراوە یۆنانی و رۆمانییەکانە[١]، بەلام ئەدەبی کلاسیکیی ئەرمەنستانی کۆن کە لە سەدەی چوارەمی پاش زایینەوە دەست پێ ئەکا، پڕە لە کەرەستەی دەوڵەمەند دەربارەی ئەو سرووشت پاکی و دراوسێ چاکییەی کە ئەرمەنییەکان لەگەڵ سەرجەمی خێڵە کوردەکاندا بەکاریان هێناوە. ئەم دوو پادشانشینە رۆژهەلاتییە کە هەردوو لایان یەکجار دێرینن، سەرچاوەی هێز و دەسەلاتیان لە کۆمەڵگای نیشتمانیی و خۆلاتی رەسەنەوە هاتۆتە دی و بنەمای ئەم کۆمەڵگایانە پشتی داوە بەسەرزەمینێکی یەکجار دەوڵەمەندەوە لە باری دەرامەدی سروشتیدا، بۆیە هەردوولا شانازی بەو سامانی رەنج و رۆشنبیری و شارستانییەتەی خۆیانەوە دەکەن کە کەڵەکە کردووی چەند سەدەی دوا بەدوای یەکە. ئەرمەنستان بەشێوەیەکی تایبەتی، رێگا و شێوازی هەرە واقیعی و ژیرانەی لەم بوارەدا هەڵبژارد و هات خێڵە کوردەکانی لە شوێن و جێگای چەسپاو نیشتەجێ کرد و بۆ کشتوکاڵ و وەرزێری لەم شوێن و جێگایانەدا پاڵی پێوەنان و هانی دان. ئەو، واتە ئەرمەنستان، وەکو هێزە بەدەسەلاتەکانی تری ناوچەکە لە پێناوی خزمەتکردنی ئاوات و ئامانجی خۆپاراستندا، خێڵە کوردەکانی پەرش و بلاو نەکردەوە بەملا و بەولادا. تیگران شای مەزن (٩١ - ٥٥ پ. ز) تەنانەت بۆ خێڵە عەرەبەکانیش ئاوایی و دێهاتی لەسەر بلندایییەکانی چیای ئەمانتوس دروست کرد[٢].

---

(١) لەبەر تیشکی ئەو نووسراوە بزمارییانەی کە دۆزراونەتەوە، سەرچاوە و شوێنی سەرهەڵدانی (پارثیا) دەبێ سەرلەنوێ چاوی پێدا بگێڕرێتەوە.

(2) Pliny: Naturalis Historiqe.

## ئێرانی ساسانی و کورد

## (٢٢٦ - ٦٣٢ پا. ز)

ئەردەشێری کوڕی ساسان نەیتوانی بناغەی بنەماڵەی نوێی فارس داچەسپێنێ تا بەپیلانێکی نامەردانە ئەرتەڤانی پێنجەمی دوا پادشای پارثیای نەکوشت (٢١٦ - ٢٢٦ پ. ز). دوای ئەو مادیکی پادشای کوردەکانی هەفبەنبوختی بەهەمان دەرد برد، ئینجا خوسرۆفی پادشای ئەرمەنستان کە دە ساڵ بوو بەری لە سەرهەڵدانی فارسەکان گرتبوو و لە سنووری هیندستان قایمی کردبوون. ئەمە نۆ نوخشەی حوکمفەرمایی ساسانییەکان بوو و دوا بەدوای ئەوەش چەند بنەماڵەی پادشای تری گەلە دراوسێکان بەپیلان یان بەشێوەی تر لەناوبران. دەربارەی وەزعی خێڵە کوردەکان لە ژێر سایەی فارسەکاندا، تەنها هەندێ تۆمار و پاشماوەی لێڵ و شێواو بەدەستەوەن بەڵام مێژووناسە عەرەبەکانی ئەم دواییە وەکو (المسعودي) و (الاصطخري) بەتایبەت باسی بیست و سێ خێڵی کورد دەکەن لە باشوور هەروەها ناوی چەند خێڵی تر لە خوراسان دێنن. پادشا ساسانییەکان هەر جار ناجارە لە لایەن هەفتاڵەکانەوە (هوونە سپییەکان) و خێڵی تری تورکەوە لە سنووری باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکەیانەوە هێرشیان دەکرایە سەر. بۆ خۆپاراستن لەم مەترسییە، چ بەزۆر چ بەخوایشت، کوردێکی زۆریان دەبردە ئەو مەرز و بوومە تا بەر لە هێرشەکانیان بگرن، ڕاستییەکەی بێزەنتییەکانیش هەمان سیاسەتییان بەکار دەهێنا تا ئەو شکستەی فارسەکان لە ساڵانی (٦٣٢ - ٦٤٠)دا لە بەردەم عەرەبەکاندا هێنایان چەرخێکی تری هێنایە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کۆنەوە.

## فەسڵی دووەم

### ئیسلام و کوردستان (٦٤٠ - ١٥١٠)

عەرەبەکان، بەلای گەلە دێرینەکانی دەوروبەری باکوری هەردوو ڕووباری دیجلە و فـوراتەوە نەناس نەبوون. لە چەندین سـەدە لەوەبەرەوە ئەوان پەیوەندی هەمەجۆرەی بازرگانی، ڕۆشنبیری و سیاسییان پێکەوە هەبوو و لەگەڵ یەکدا ناسیاری و شارەزاییـیەکی تەواویان بنیات نابوو. بەڵام کاتێک کە عەرەبەکان لەشکرشکێنانە بەپرتاوی ئایینی تازەوە هاتن، کوردەکان، ئاشوورییەکان و هەموو گەلەکانی دەوروبەریان پاڵیان دایە پاڵی دەوڵەتی فارسەوە و لە ژێر ئالای - شاهی شاهان -دا بۆ بەرەنگاربوونی لافاوی هێرشی عەرەبەکان کەوتنە خۆ. بەڵام ئەم لێشاوە بەتەواوی لەو لێشاوە جیا بوو کە دە هەزار زەلامەکەی ئەسکەندەری مەزن هێنابوویان، بۆیە فارسەکان خۆیان لەبەری بۆ نەگیرا. ئەو مێژووناسانەش کە بەچاوی خۆیان ڕووداوەکانیان بینیوە چ ئەرمەنی و چ عەرەب، چ سوریایی، چ ڕۆمی بێزەنتی باسی گەلێ جەنگی پاڵەوانانەی کوردەکانیان دژ بەهێرشبەرەکان کردووە. بەگوێرەی ئەو سیاسەتەی کە هێرشبەرەکان لەسەری ئەڕۆیشتن بچوونایەتە هەر وڵاتێک لەوێوە بەناوی خەلیفەوە بانگەوازی خەڵکی وڵاتەکە و دەوروبەریان دەکرد، کە یان وەرنە سەر ئەم ئایینە تازەیە، یان دەبێ باج و خەراج بدەن. ئەم باج و خەراج دانانەشیان بۆ ئەوە نەبوو سەرشۆڕی و نزمی بەو گەلانە بنوێنن کە دەکەوتنە ژێر ڕکێفیانەوە، بەڵکو وەکو سەرچاوەیەکی دارایی و دەرامەد بۆ خۆیان بەکاریان دەهێنا. عەرەبەکان ئیسلامیان بەزۆر بەسەر سەرزەمینی ئێراندا داسەپاند، چونکە فارسەکان خوانەناس بوون و سروشت پەرست، بەڵام بەرانبەر بەهەموو گەلانی تر، واتە گەلانی خاوەن کتێب و نامە نەرم و سوکبار بوون... لە ماوەی نزیکەی حەفتا ساڵدا (٦٤٠ - ٧١٠) چەند ڕێککەوتنامەی ئاشتی لەگەڵ گەلە «خاوەن کتێبەکانی» نێوان ڕووباری دیالە و چیاکانی

قەفقاسدا بەسترا. جێی سەرنج دانە کەوا خەلیفەی عەباسی لە بەغدا هەرگیز نەیتوانی تەنانەت سەر بەو خێڵە کوردانەش دانەوێنێ کە لە پایتەختەکەیەوە نزیک بوون. بەپێچەوانەوە ئەو شەڕە خۆبەخۆییانەی کە لە ناو ئیسلامەکان خۆیاندا ڕووی دەدا، بوو بەمایەی خۆشکردنی ڕێگا بۆ سەر بڵندکردنەوەی «گەلانی خاوەن کتێب»یش لە ناوچەکەدا بۆیە خەلیفە ناچار بوو ژمارەیەکی زۆر کۆیلەی تورک لە ئاسیای ناوەندەوە بێنێ و بیانکا بەسەرباز تا لە شەڕەکانی دژ بەبەرهەڵستکەرەکاندا بەکاریان بێنێ. لەگەڵ ئەمەشدا پادشایەتییەکانی کورد، ئەرمەنی، گورجی و هی تر کە هێشتا بەناوە هەر بەبرا گەورەیی دەوڵەتی خەلیفەی ئیسلام ڕازی بوون، لە سەدەی نۆیەمدا دیسانەوە سەریان قووت کردەوە و کەوتنەوە جموجووڵ. بەگە کوردەکان (میری دەرەکان - دەرەبەگی تورکی) دیسانەوە دەسەڵاتی دێرینەی خۆیان بەسەر هەندێ شوێنی وەکو ڕۆژئاوای ئێراندا داسەپاندەوە.

ئەوە بوو ئەبو عەلی بن مەروان بن دۆستەک ئەلبابخی ئەلچاربوختی[1]، یەکێک لە سەرکردە هەرە مەزنەکانی کۆمەڵە خێڵی مێژوویی بوختی - بابخی وەکو لە ناوەکەیەوە بۆمان دەردەکەوێ، دەوڵەتێکی بۆ خۆی لە باکوری ڕووباری دیجلە دامەزراند و شاری (فارقین)ی کە ڕۆژەڕێیەک لە ژووررووی دیاربەکرەوەیە کرد بەپایتەخت. فارقین هەمان شاری دێرینەی تیگرانۆ گێرتایە کە سەردەمێک پایتەختی باشووری پادشای بەناوبانگی ئەرمەن تیگرانۆگێرت بووە، بەڵام مەروانی چاربوختی بەناوی بنەماڵەی خۆیەوە واتە ناوی چاربۆختی (چوار خێڵی بوختی؟) بانگی پادشایەتی خۆی هەڵنەدا بەڵکو چ خۆی و چ ئەوانەی بەدوایدا هاتن ناوی «مەروانیە»یان بۆ خۆیان هەڵبژارد ئەوەش وەکو دەردەکەوێ دەبێ لەگەڵ کەش و هەوای سیاسیی گشتیی ئەو سەردەمەی ئیسلامدا گونجاوتر بووبێ... دەوڵەتی مەروانی حوکمڕانی فارقین و دیاربەکر و جزیرەی ئیبنی عومەری لە (٩٨٥)ەوە تا (١٠٩٦) کرد. یەکێک لە پادشاکانی کە بەئەبو

(١) ناوی خۆی (باد Badh) بوو و بنەماڵەی مەزنی بەدرخانی ئێستا نەوەی ئەون.

نەسری ئەحمەد بەناوبانگە، پەنجا و سێ ساڵ حوکمڕانی کرد (١٠١٠ - ١٠٦٣) و شارەکانی ژێر دەستی بەبینای چاک و کاروانسەرا و گەرماو و پرد ڕازاندنەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو شەڕی ناوخۆ لە نێوان نەوەکانی خێزانی حوکمڕاندا لەسەر تەختی حوکمڕانیی تەقیەوە و هەریەکە بۆ گران کردنی تای تەرازووی خۆی لە زۆرانبازییەکەدا بەپەلە پروسکێ کەوتە دەست و دامێنی ڕۆمە بیزەنتییەکان.

ئەمانیش هەروەکو گەلێ دەوڵەتی تری هاوبەشی عەرەب و کورد، یان کورد و فارس کە لە نێوان کوردستان و دەریای خەزەردا ستوونی دەوڵەتی خۆیان داکوتا بوو و بەناوە سەر بەخەلیفەی ئیسلام بوون لە بەغدا، ئەوەندەی پێ نەچوو کەوتنە بەر شالاوی سەلجووقییە برسییەکان. ڕۆمە بیزەنتییەکان نەک هەر نەهاتن بەهانای دۆستەکانیانەوە، بەڵکو لە ئەنجامی دەستێوەردان و لووت ژەنینی ناڕەوای ناو کاروباریانەوە، بوون بەمایەی لاوازکردنی گیانی بەرهەڵستکاری و خۆڕاگیریشیان لە ڕووی سەلجووقییەکاندا. خەڵکە شار و دێهات نشینەکان بەرەنگاری گیروگرفت و چەرمەسەریی یەکجار سەخت بوون. بەڵام زۆربەی خێڵە کوردەکان چونکە کۆچەر بوون، خێزان و مێگەلە مەڕ و ڕەوە ولاخ و هەر شتێکی تریان کە بۆ گواستنەوە ئەشا، لێک ناو خۆیان لە ناو بەرزاییە سەختەکانی دوو توێی چیاکاندا حەشاردا چونکە لەوێ باشتر دەیانتوانی پارێزگاری خۆیان بکەن. سەلجووقییەکان کە لە بنەڕەتدا بیابان نشین و بەچکەی دەشتە لماوییەکانی ئاسیای ناوەند بوون، زاتی ئەوەیان نەدەکرد بۆ ناو هەزار بەهەزاری ئەم چیا سەرکەشانە مل بنێن، بۆیە پۆلە کوللە ئاسا خۆیان بەرەو ئاسیای بچووک کوتا و جگە لە چەند وردە سوڵتانێک بەولاوە کە بەئەتابەگ دەناسرێن و زۆربەیان خۆولاتی بوون هیچی تریان لە پاش خۆیان بەجێ نەهێشت. لەم سەردەمەدا دیاردەیەکی خەتەرناکتر و پڕ مەترسیتر و ماڵ وێرانکەرتر لە ئاسۆوە ڕووی کردە دەزگای دێرینەی کۆمەڵایەتی ئەو سەرزەمینە...

لێشاوی شەپۆل بەدوای شەپۆلی هەزارەها هەزار تورکمانی لەسەر

زەمینی خۆ تاربووی، پێ پەتی، برسی، زگ ڕووت، بەخاووخێزانەوە چ بەپێ، چ بەعەرەبانەی گا بەرەو شیو و دۆڵە لێنک و پڕ لەوەڕەکانی نێوان دەریای خەزەر و کوردستان بەپەلە و پڕتاو وەکو پۆلە کوللە، هێرشی هێنا (١٠٨٠ - ١١٠٠). میخائیلی پەترەکی سووریا کە بەچاوی خۆی ڕووداوەکانی ئەو دەمەی بینیووە، هەروەها ئیبنولئەثیری مێژووناسی عەرەب، بەتەواوی و دوورودرێژی باسی چۆنیەتی ئەو بەرهەڵستکاری و بەرگرییە خوێناوی و نەپچڕاوەیان کردووە کە تیرە کوردەکانی بوختی، هەمەوەند، شکاک و هی تر دژ بەم غەوارە تورکمانانە بۆ پاراستنی لەوەڕگە و ئاواییەکانیان کردوویانە. بێ یەکێتیی ناوخۆ و کاری گشت لایەنە، ئەم تیرانە، یەکە یەکە و بەتەنهایی، قارەمانانە بۆ بەرگری کردن لە سەرزەمین و ماڵ و سامانی خۆیان جەنگیون. بەڵام لە کۆتاییدا بەتەنیایی توانای بەرگرتنی لێشاوەکەیان، نەبووە و ناچار ڕێگایان بۆ چۆڵ کردووە تا تێپەڕ بووە...

## سوڵتان سەلاحەدین و خاچدارەکان

**(١١٣٧ - ١١٩٣)**

وێ دەچێ، ئەو مەترسییە گەورەیەی کە بەنیشتەجێ بوونی تیرە تورکمانە کۆچەرەکان لە دەشت و دۆڵەکانی زاگرۆسدا ڕووبەڕووی سەرزەمینی کوردان بووەتەوە، وای لە سەرکردە کوردەکان کردبێ کە بکەونە پەیجووری کردنی چارەیەک بۆ خۆیان. یەکێک لە ناودارترین و مەزنترینی ئەم سەرکردانە، یوسف سەلاحەدینە کە ساڵی (٥٣٢)ی هیجری ڕێکەوتی (١١٣٧ - ١١٣٨ی پ. ز) لە ناو قەڵای تکریتی (باکووری عێراق)دا لە دایک بووە. ئەیوبی باوکی کە کوڕی شادیە، لەوێ حوکمدار دەبێ. ئەیوب خۆی لە (دوین)ی ئەرمەنستان لەسەر ڕووباری ئاراس هاتۆتە دنیاوە. لە سەردەمی لاوییدا، لای (زەنگی)ی ئەتابەگی موسڵ دێتە سەر کار و دوایی دەبێتە حوکمداری بەعلەبەک. سەلاحەدین لەم شارەدا پەروەردە دەبێ و پێدەگا. دوایی خەلیفەی فاتیمی لە قاهیرە دەنێرێ بەدوایدا و لە سوپاکەی خۆیدا جێگیری دەکا. ساڵی (١١٧١) سەلاحەدین دەوڵەتی خەلیفەی فاتیمیی بەتەواوی لەناو برد و لەجیاتی ئەو دەوڵەتی ئەیوبی بەناوی باوکییەوە دامەزراند. بەسوود وەرگرتن لە هەندێ بارودۆخی لەبار و بەپیلانی ژیرانە، ئەم پاڵەوانە موسڵمانە مەزنە سوریا و عێراقی لە ژێر فەرماندەیی خۆیدا یەکخست و بەرە بەرە سەری بەئەتابەگی حەڵەب و موسڵ و دیاربەکر و چەند میری تری سەلجووقی و کورد و عەرەبیش دانەواند. بەم جۆرە ئەمسەری دەوڵەتەکەی لە دوورگەی عەرەبەوە دەستی پێ دەکرد و کۆتایی لە ڕووباری دیجلە دەگەڕایەوە، نەک هەر ئەمە، بەڵکو سوڵتانی سەلجووقییەکان لە قۆنیەش ناچار بوو خۆی بکوتێتە ژێر باڵی ئەمەوە. هەروەها زۆربەی ئەو مەملەکەتە لاتینیانەی لە ناو برد کە لە قودس و لەسەر کەنار و ڕۆخەکانی سوریا قووت بووبوونەوە یان نینۆکی کردن. سەلاحەدین باش دەیزانی کە سەرکردەکانی ئەوروپا دانی لێ تیژ

دەکەن و شیر و تیری لێ نەسوون، بۆیە بانگەوازی بۆ هەموو گەلانی ڕۆژهەڵات هەڵدا کە بۆ شەڕی خاچدارەکان خۆیان ئامادە بکەن و کە قەوما لە دڕدان و گەڕاندنەوەیان دریغی نەکەن. تیرە کوردەکانی سەرزەمینی گۆتۆ و بوهتان، یەزیدییەکانی سنجار، ژمارەیەکی زۆری عەرەب و ئاشووری و ئەرمەنی و گورجی بەپیری ئەم بانگەوازەوە هاتن و چوونە ژێر ئاڵایەوە. هەرچی ئیمپراتۆر و پادشاکانی ئەوروپای ڕۆژئاواش بوون هەموو خۆیان پێچایەوە و شاڵاوی سێیەمیان بۆ ڕزگارکردنی شوێنەوارە پیرۆزەکانی مەسیحییەت لە دەستی سەلاحەدین سازدا. سوپایەکی یەکجار گەورە لە فەرەنسییەکان، ئەڵمانەکان، ئینگلیزەکان و گەلەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات سازدرا و هێرشی هێنا، بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو دەبدەبە و ناوی زل و هات و هەرایە کە بەرپا کرا سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان وەدەست نەهێنا. جارێ نۆ نوخشەی هێرشەکەیان بەتاڵانکردنی سەرزەمینی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کردەوە کە برای ئایینی خۆیان بوو. ئیمپراتۆر فرەدریک باربارۆسا کە فەرماندەی گشتی هێرشەکە بوو، لە ئاوی سقلیە لە کاتی مەلەکردندا خنکا و زۆربەی ئەوانەی بەدوایەوە بوون بڵاوەیان لێ کرد. لە لایەکی ترەوە پادشایان ڕیچاردی شێردڵ، فیلیپ و ئۆگۆست ئەوەندە دژ و دوژمن بەیەک بوون، کە لە ترسی یەکتر جووڵەیان بۆ نەدەکرا بۆیە دوای داگیرکردنی چەند شارێکی کەناری دەریا لە سوریا ناچار مان بکشێنە دواوە پاش ئەوەی زۆریان لەگەڵ خۆیاندا برد بەڵام کەم فێربوون... لەگەڵ ئەوەشدا کە سەلاحەدین ساڵی ١١٩٣ مرد و چوارەم شاڵاوی بێ تین و ئاکامی خاچداران دوا بەدوای ئەوە ڕوویدا، بەڵام هەر شەخسییەتی پاڵەوانانەی ئەو بوو کە پێشی لە هێزە خاچدارەکان گرت ڕۆژهەڵاتی لە چەنگ و چنگاڵیان پاراست، دیسانەوە لە زمانی مێژووناسە عەرەبەکانەوە پێمان دەگا کەوا ئەو کەسەی پادشای فەرەنسییەکانی لەم جەنگەدا دەزگیر کردووە دەرباسی سەرۆک خێڵی کورد بووە و کەوا یەزیدییە میهرانییەکانی سنجار چەند سەرکردەی فەرەنگەکانیان لەو شەڕانەدا بەدیل گرتووە. لە سەردەمی

حوکمڕانییدا، ئەم پادشا موسڵمانە مەزنە، برا و خزمەکانی خۆی لەسەر تەختی پادشایەتی سوریا و موسڵ و ئەرمەنستان جێگیر کرد.

گەر بهاتایە و لەو کاتەدا کە لە هەرەتی دەسەڵات و توانای دابوو دەستی بکردایە بەسازدانی شوێن و ڕێی پێویست بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی کوردان لە سەرزەمینی زاگرۆس و ئەوەی بکردایە بەبنکەی سەرەکی بۆ خۆی و هەمان کاری لە ئازربایجان و ئەرمەنستان و تۆرۆسیشدا بکردایە ئەوا چاکەیەکی ئەوتۆ بەردەوام و نەکوژاوەی دەکرد کە نەک تەنها گەلەکەی خۆی بەڵکو هەموو ناوچەکەش لە ژێر سێبەریدا هەتا هەتا دەحەسایەوە چونکە ئەو سەردەمە ئێران پەرێشان بوو، ڕۆمی بێزەنتە وەکو هەمیشە بێ هێز و هەڵوەشاو مەملەکەتی گورجستان هەروەها شازادە ئەرمەنییەکانی خوارووی ڕووباری ئاراس هێشتا دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان نەکەوتبووە دەست و هەموو لاواز و بێ تین بوون. بەڵام کە سەلاحەدین خەلیفەیییەتی میسری هەڵبژارد و وەچەکانی لە دۆڵی نیلدا جێگیر بوون ئیتر هێزێکی کاریگەری ئەوتۆ نەما کە سەرجەلەی هەموو کارەکانی ڕۆژهەڵات بگرێتە دەست بۆیە ئەم سەرزەمینە بێ پارێزەر و پاسکەر مایەوە و خێڵە کۆچەرەکانی ئاسیای ناوەڕاست لووتیان تێ ژەنی و داگیریان کرد.

## هێرشی مەغۆل و تەتەرەکان

(١٢١٠ - ١٥٠٠)

ڕووداوێک کە لە سەردەمی ئەم هێرشانەدا لە ئاسیای ناوەڕاست ڕوویداوە هەندێکمان لە هەڵوێستی کوردان لە بەرانبەر داگیرکەراندا بۆ دەردەخا. هۆلاکۆ لەشکرێکی گەورەی مەغۆلی ساز دابوو و خەریک بوو بەرەو ڕۆژئاوا دەکەوتە ڕێ تا خیلافەتی عەرەبی لەسەر کار لادا و ئاسیای ڕۆژئاوا داگیر کا. بەر لە بەڕێ خستنی، خان مانگۆی برا گەورەی بەرەو ئەوێ، ئەم فەرمانانەی بۆی دادا: «هەمیشە بۆ ئامۆژگارییەکانی دوکوز خاتوونی شازادەی گاورەکان گوێڕایەڵ بە، ڕەفتارت لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە سەرت بۆ دادەنەوێنن چاک بێ! هەر کەسێ سەرپێچی کرد دایبڕزێنە! هەموو قەڵا و قەڵایچەکانی سەر ڕێگات لەگەڵ خاکدا یەکسان کە... هەر لە توورانەوە هەتا ئێران مەوەستە. کە ئەمانەت تەواو کرد، بەرەو عێراق بکشێ... ئەو لوڕ و کوردانە هەموو لە ڕیشە دەرکە و شوێنە قایمەکانی گردەکۆ و لەمپەنسەریان وێران کە کە لێیانەوە هەمیشە خەریکی چەتەیین و ئۆقرە لە ڕێبواران دەبڕن» (١).

هێزی پێشەوەی لەشکرەکەی هۆلاکۆ کە نەیمان قیت بوغا سەرکردەیی دەکرد، دای بەسەر حەشیشەخۆرەکاندا کە لە کوهستان نیشتەجێ بوون و هەر کەسێکی کەوتە بەردەست بێ یەک و دوو سەری بڕی. ئینجا بەشی سەرەکی لەشکرەکە ڕووی کردە هەمەدان و لەوێوە خۆی گەیاندە چیاکانی کوردەکان. لە کرماشان، هۆلاکۆ فەرمانی دا سوپاکە بەرەو بەغدا بکشێ، لەشکرێکیشی خستە ژێر فەرماندەیی ئەرقیا - نۆیانەوە تا ڕوو بکاتە هەولێر و ئەو قەڵایەی کە «وێنەی لەسەر ڕووی زەمین نییە»... و پەلاماری ئەو لەشکرە کوردە بدا کە شارەکەی دەپاراست. ساڵح هەولێری فەرماندەی

(1) M. Quatremere. Histoire des. Mongols de la Perse. 1830. vol. 1. part II. p 114/315.

لەشکری کوردەکان دڵی بۆ خۆ بەدەستەوەدان لێی دەدا، بەڵام هێزەکەی ملی نەدا و کاتێ هەولێ دا بۆ لای فەرماندەی مەغۆلەکان بچێ، سەربازەکانی خۆی ڕێیان لێی گرت و کوشتیان و شەوێک لە نیوەشەودا لەشکری کوردەکان لە قەڵاکە دەرپەڕی و لەناکاودا لەگەڵ ئابڵووقەدەرکاندا بەیەکا تەقی و ئەوەی بەر دەستیان کەوت سەریان بڕی و هەموو کەرەستە و تفاقی ئابڵووقەدانەکەیانیان تەفروتونا کرد و بەپەلە خۆیان کوتایەوە ناو قەڵاکەوە. ئەم کارەساتە ئەژنۆی ئەرقیا نۆیانی هێنایە لەرزە و دڵی لە ئابڵووقەکە سارد کردەوە، بۆیە کە هاوین داهات وازی هێنا. ئینجا کوردەکان لەسەر نەریتی هەمیشەیی خۆیان قەڵاکەیان چۆڵ کردەوە و مەڕومالاتی خۆیان دایە پێش و بەرەو کوێستانەکان کەوتنە ڕێ، تەنها دوای ئەمە مەغۆلەکان توانیان هەولێر بگرن و قەڵاکەی وێران کەن. لە لایەکی ترەوە خێڵە کوردەکان زۆر بەتوندی بەرەنگاری هۆلاکۆ بوونەوە بەتایبەتی لە بۆتان و دیاربەکر بەرگرییەکی زۆریان لە ڕوویدا کرد بەڵام لە کۆتاییدا ناچار بوون دەستبەردار بن و تووشی ڕەشەکوژی و بێوڵەتییەکی زۆر بوون لە دوو سەدە و نیوی دوای ئەوەدا (١٢٦٠ - ١٥٠٢) حوکمداریی مەغۆلە ئێلخانییەکان و هی تەیموور لەنگی تەتەر (١٣٨٧ - ١٤٠٥) و نەوە و پاشماوەکانی هەمیشە لە لایەن کوردەکانەوە شان بەشانی ئەرمەنییەکان، تەنانەت تورکمانەکانی (مەڕە سپی - ئاق قۆینلۆ)ش کە لە دوو سەدە لەوەو بەرەوە لە مەڵبەندەکە جێگیر بووبوون بەرهەڵستی لەگەڵدا کراوە. هەرکە گێژەلۆکە و زریانی ئەم هێرشانە دەهاتنە کۆتایی و دەنیشتنەوە، خەڵکە خۆلاتییەکە دەکەوتنەوە سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی وێرانە و کەلاوەکانیان و ئابووری پیشەسازی یان مەڕ و مالاتداری خۆیان سەرلەنوێ لە یەک دوو ساڵێکدا دادەمەزراندەوە. بنیاتنانەوە لە سیستەمی ساکاری ئابووری سەدەکانی ناوەڕاستدا کارێکی ئەوتۆ گران نەبوو.

# فەسڵی سێیەم

## هەڵمەتی جیهانگیریی عوسمانییەکان و خێڵە کوردەکان

## (١٥١٤ - ١٨٩٠)

لەگەڵ داهاتنی سەدەی شانزەیەمدا، چەرخێکی نوێ هاتە کایەوە. ئێران پاش نۆ سەدە ژێردەستەیی و بێ سەروبەری (٦٣٩ - ١٥٠٢) سەرلەنوێ سەری بڵند کردەوە و لە ژێر سەرکردەیی شا ئیسماعیلی سەفەوییدا یەکپارچەیی و سەربەخۆیی خۆی هێنایەوە دەست و پایتەختی لە تەورێز (ئازەربایجان) و پاش ئەوە لە ئیسفەهان داکوتا. لەولاشەوە ئیمپراتۆریەتی ئالی عوسمان کە بەچاکی لە ئەستەموول و وڵاتەکانی بەڵقان پێی قایم کردبوو چاوی بڕیبووە ئەو سەرزەمینە پان و بەرینەی دەکەوتە نێوان ڕووباری فورات و ئیمپراتۆریەتی سەرلەنوێ دامەزراوەوەی فارسەوە، واتە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستان و گورجستان.

هەڵوێستی ئەم گەلە خۆوڵاتیانە گرنگییەکی زۆری هەبوو، چ بۆ شا، چ بۆ سوڵتان. ئەوان ئێرانیان باش دەناسی چونکە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو لە پاڵ یەکدا ژیابوون بەڵام تورکیا دوورتر بوو و ڕەفتاری حوکمڕانەکانی هێشتا لای ئەم گەلانە ڕوون و تاقیکراوە نەبوو. سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢ - ١٥٢٠) کە یەکێک بوو لە سوڵتانە هەرە بەهێزەکانی عوسمانی، پاش ئەوەی باوکی لەسەر تەخت لادا، هاتە سەر کار. ئەمیش وەکو زۆربەی تورک و عەرەبەکان (سۆفی)یەکی دڵسۆز بوو، لە کاتێکدا فارسەکان (شیعە) مەزەب بوون. سوڵتان سەلیم سەربڕینی نزیکەی چل هەزار شیعەی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی کرد بەنۆ نوخشەی سەردەمی حوکمی خۆی و لە ئەماسیای پایتەختی زستانەیەوە داوای لە شای سەرزەمینی فارس کرد، کە لە هەڵە ئایینییەکانی پاشگەز بێتەوە و چیتر تەتەڵە نەکا و ئەو سەرزەمینانەی کە «هی تورکن» بداتەوە دەستی خاوەنیان. وەڵامی شا تا بڵێی توند و پڕ لە وشەی ڕەق بوو. ئەو شەڕەی

پاشان لە سەرینی ئەو هەڕەشە و هەڕەشەکارییەوە بلێسەی سەند دوو ساڵی خایاند (١٥١٤ - ١٥١٦). لە دەشتی چاڵدێرانی نزیکی شاری قارس، فارسەکان بەتەواوەتی بەزین و شا پاش ئەوەی تەخت و گەنجینەکەی بۆ سوڵتان بەجێهێشت، بەپەلە پروسکێ خۆی ڕزگار کرد.

سەرکەوتنی عوسمانییەکان لە چاڵدێران بەسەرەتای مێژووی هاوچەرخی تیرە کوردەکان دادەنرێ. دابەشبوونی جوگرافیاییان، دابەشبوونیان بەسەر لق و پەلی تیرەییدا، هەروەها شوێن و مەڵبەندی تیرەکان و سەرۆکەکانیان لە سایەی هەوڵ و تەقەلای مەلا ئیدریسی دانیشتووی شای بتلیسەوە زیاتر ڕوون و باشتر دەستنیشان کرا. ئەم سیاسەتمەدارە کوردە وەزیری کاروباری دەرەوەی یاقووب خان بوو[1] کە یەکێک بوو لەوانەی بەتەمای پادشایەتی ئێران بوون. مەلا ئیدریس، لە چاڵدێران خزمەتێکی زۆری بەسوڵتان سەلیم گەیاندبوو لە بواری ڕێنومایی و ئامۆژگاری کردنییدا دەربارەی وەزع و بارودۆخی کوردستان و ئەرمەنستان. ساڵی (١٥١٥) سوڵتان ئەمی لە ئەماسیەوە نارد بۆ کوردستان و چەند نامەی پڕ لە بەڵێن و قسەی خۆش و دیارییەکی زۆری پێدا بۆ سەرگەورە ناودارە کوردەکانی وڵاتی گۆتۆ و زاگرۆس نارد تا لە هاوکاری و سەر بەپادشای فارس بوون وەریانگێڕێ و بەلای عوسمانییدا دایان گێڕێ. لە وەڵامی بانگەوازی سوڵتاندا نۆ دەرەبەگی کورد بوون بەپاڵپشتی عوسمانییەکان (أ).

جگە لەمە، مەلا ئیدریس لەگەڵ چل تیرەی گەورەی تری دانیشتووی چیا سەختەکانی زاگرۆس و تۆرۆسدا بەناوی سوڵتانەوە جۆرە پەیمانێکی بەست. سوڵتان بۆ هەریەکە لەمانە فەرمانی سوڵتانیی ناردبوو و، بەگوێرەی ئەو فەرمانانە ئەو سەرەک خێڵانە کرا بوون بە بەگلەر بەگی (بەگی بەگەکان - وەرگێڕ) بەسەر سەرزەمینی خۆیانەوە و مان و دەسەڵاتی نەگۆڕی بۆ

---

(١) مەبەست سوڵتان یاقووبی خاڵی شا ئیسماعیلی سەفەوییە کە ئەویش بەڕەچەڵەک کوردە. بڕوانە وتارەکەی مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی لە ژمارە (٥٧)ی ساڵی ١٩٩٣ گۆڤاری ڕەنگیندا - وەرگێڕ -.

پشتاوپشتیان بەسەر قەڵا و قەڵایچە و زەویوزارەکانیاندا دووپات کردبووەوە. سەرەڕای ئەمە پلەی «حکومەتیی» کوردیشیان پێ درا بوو، کە جگە لە سەرانەیەکی ناچیز و دانی ژمارەیەکی دیاریکراوی سواری چەکدار لە کاتی شەڕدا، هیچ گرانبارییەکی تری پێوە نەخرا بووە سەریان. ئەم نۆ بەگلەر بەگە کوردە (کە خۆیان ناوی - دەرەبەگ -یان پێ خۆشتر بوو) حکومەتی ناو حکومەت بوون (ب) و خرابوونە ژێر فەرماندەیی باڵای بەگلەر بەگی ئەنەدۆڵەوە کە سەرکردەی گشتی ئاسیای عوسمانیی بوو (ج). ئامانجی ئەم نەخشەیەی مەلا ئیدریس، لە پێش هەموو شتێکدا، پاراستنی هەرێم و ناوچەکان بوو لە هێرش و داگیرکردنی دوارۆژ لە لایەن ئێرانییەکانەوە. ئەو سەرزەمینەی دەکەوتە نێوان ڕووباری دیالە و هەردوو زێی گەورە و بچووکەوە لە لایەن «حکومەت»ە کوردەکانەوە دەپارێزرا. مەلا ئیدریس باش لەوە ئاگادار بوو کە دڵی دانیشتوانی ئەرمەنستانی گەورە، وەکو ڕاستییەکی مێژوویی، هەر بۆ فارسەکان لێ دەدا و بۆ ئەوەی شوێنە ستراتیژییەکانی دۆڵی ڕووباری ئاراس لە هەر مەترسییەک دوور خاتەوە، چ خۆی و چ ئەوانەی بەدوای ئەودا هاتنە سەر کار، چەند بەشیان لە تیرە مەزنە کوردەکانی دیاربەکر و تۆرۆس هان دا تا بۆ وان و قارس و ناوچەکانی تری ئەرمەنستان کۆچ کەن و بەڵێنی پێدان گەر بێتو بۆ ئەو ناوچانە بگوێزنەوە و لەوێ جێگیر بن ئەوا بەتیماری سەربازی[1] و مووچە بەرات و پلە و پایەی دەوڵەتی خەنییان دەکا.

بەم جۆرە تورکەکانیش هەمان کار و ڕەفتاریان کرد کە لە چەندین سەدە لەوەو بەرەوە پیشەی فارسەکان بوو، واتە پەرت و بڵاوە کردن بەخێڵ و تیرەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستی سەربازی خۆیان.

پەیمان بەستانی بێ یەک و دوو کردن و هیچ سەرپێچی نەکردنی ئەم

(١) تیماری سەربازی Millitary Fiefs ئەو زەویوزار و ئاو و بەراوانە بوو کە سوڵتان بەفەرمان بەرامبەر بەپێشکەش کردنی یارمەتی سەربازی لە کاتی شەڕدا بەهۆز و خێڵەکانی دەدا.

خێڵـه کـوردانه، تەنـها بەرهەم و ئاکـامی تەڵـەلا و نێـوانکەوتنی مـەلا ئیدریسی کەڵەپیاوی باوەڕ پێکراو و ڕووناکبیری کورد بوو کە وەکو دیارە توانیـویە ئەم سەرەک خێڵە ژیر و دنیا دیتانە نەرم کا خۆیان لەو سوود و قازانجە مەزنانە بێ بەش نەکەن کە بەستنی پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ دەوڵەتی عـوسـمـانیـیـدا بۆیانی دەرەخسێنێ. وا دەردەکەوێ ئەم دارە ڕا ژیرانەیە تا دوو سەدە دوای ئەوە بەردەوام بەری بەخشیبێ. ئەگەرچی ئەو جەنگە وێرانکەر و درێژخایەنانەی کە پاشان لە نێوان عوسمانی و ئێراندا ڕوویدا (١٥١٤ - ١٥١٦)، (١٥٣٤ - ١٥٣٦)، (١٥٨٧ - ١٦٢٨)، (١٦٣٦ - ١٦٣٨)، (١٧٢٤ - ١٧٣٢) بەشـــــێکی زۆری نـاوچە سنووریـیەکـانی وێران و تەفـروتونا کـرد و گـیـانی هەزارەها گـەنجی لە ڕۆڵەکــانی ئەو خــێــڵانەی، کــە بێ یەک و دوو خــۆیان بۆ جــەنگی عوسمانییەکان دژ بەئەوروپاییەکان ناونووس دەکرد، کرد بەگەرووی ئاشی ئەم جەنگە بێ ئامانەدا. دوای ئەوە، گەلێک سەرکردە، بەتایبەتی ئەوانەی لە چیـا زۆر سـەخت و دووردەسـتـەکـاندا دەژیان، بێ ئەوەی هیچ ئەرک و برکێک بگرنە ئەستۆ، پشت بەپشت بەروبووی ئەم پەیماننامەیەیان خوارد. ئەوان بێ ئەوەی هیچ باج و بەراتێک بدەن یان تەنانەت ســـەربازێک پێشکەش بەدەوڵەت بکەن، لە سایەی حوکمی ئۆتۆنۆمیـیدا ڕایانبـوارد. کـارەکـە دەبوو هەر واش بشـکێـتـەوە و ئەوان نە باج بدەن نە خـەراج و نە سـەرباز، چونکە با ڕەگـەز و ئایین و دەسـەڵات بخـەینە ئەولاوە، ئەوەی کـە دەیەویست لە لای ڕۆژئاواوە ناوچەکانیان داگیر بکا «ڕۆمی» بوو - واتە خەڵکی سەرزەمینی ڕۆم - و لەبەر ئەوەی وابوو دەبوو بەرهەڵست بکرێ و بەقسەی نەکرێ. ئەم خێڵانە کە لەو هەردە و دۆڵانەدا لە هەموو دونیا دوور بوون، بێ ئاگا بوون لەوەی کـە ئەم تورکـە ڕۆمـێنراوانە[١] ئەگـەرچی لە ڕۆژئاواشەوە دەهاتن بەبنەچە خەڵکی ئاسیای ناوەڕاست بوون.

---

(١) تورکی ڕۆمێنراو: ئەو کەسەی کە بەڕەگەز تورکە، بەڵام چونکە لەسەر زەمینی ڕۆم دەژێ بووە بەڕۆمی - وەرگێڕ -.

سەرەڕای ئەمە، هۆی تریش هەبوون کە وایان لە سەرەک خێڵەکان دەکرد هەمیشە مل کەچی ئەو پەیمانانە نەبن کە بەستبوویان.

ئێران دراوسێی دەرگا بەدەرگای سەرزەمینی کوردان بوو و، ئەگەرچی لە ناو گێژاوی شپرزەیی بێ سەروبەرییدا دەژیا، بەڵام دەشا ببێ بەدوژمنێکی خوێنخۆر گەر زۆر و بەردەوام پێی بەزگ دابنرایە. جگە لەمە ئەستەموولی پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تا بڵێی دوور بوو و تا سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانوونی (١٥٢٠ - ١٥٦٦) ئیمپراتۆریەتەکە خۆی بەجۆرێ لە ئەورووپا تووش هاتبوو کە ماوەی دەرچوون و ڕزگاربوونی نەبوو، ئەمە جگە لەوەی شارستانییەتی تورک نەیتوانی دڵی کوردەکان داگیر بکا و بەلای خۆیەوە بیانکێشێ. سەرکردە کوردەکان، ئەگەرچی نەخوێنەوار بوون و تا ئەم سەردەمانەی دواییش نائاگا لە جیهانی دەرەوە، بەڵام هەریەکەیان خاوەنی دوو چاوی تیژ و دووربین و توانایەکی گەورەی لێکۆڵینەوە و هەستێکی بەکار بوون. دووربینی و سایشت وردی هەر سەرکردەیەکی تەواو سەرکردەی کورد، تا بڵێی کاریگەرە و تاوتوێ کردنی مەسەلەی گرنگی هەمیشە ورد و نیشان پێکە. هەموو باش دەیانزانی کە ئەم داگیرکەرە تورکانە، نە خاوەنی زمانی ئەدەبی و نە خودانی ئەدەبی تایبەتی خۆیان بوون و کەوا لەبەر نەبوویی ناچار بوون ئەلف و بێی عەرەبی و وشە بەندی عەرەبی و فارسی بۆ نووسینی زمانەکەیان بەکار بێنن، لە کاتێکدا، ئەوان، واتە کوردەکان، نەک تەنها لە ناو چیرۆک و داستانی پاڵەوانانەی ڕەگەزەکەی خۆیاندا دەژەلانەوە، بەڵکو لە مەیدانی شیعری عەرەبی و فارسیدا سوار و زەبەردەست بوون.

هەموو ئەمانە با لەولاوە بوەستێ، بەڵام لەشکرەکانی عوسمانی سەرکەوتنی وایان وەدەست دەهێنا لە ئەورووپا کە لە هەموو جیهاندا دەنگی دەدایەوە. بەدرێژەی زۆربەی ساڵەکانی سەدەکانی شازدە و حەڤدە، هەموو فەرەنگستان (ئەورووپا) لە زرمەی پێی سەربازی عوسمانی لەرزی و ڕەویەوە. دراوسێ دەرگا بەدەرگاکەش - واتە عەجەم (د) - چونکە ئێران

زۆرتر بەم ناوەی لای گەلە دراوسێکان ناسراوە دانی بەخۆیدا گرتبوو خۆی دەپاراست بەڵام بەخت یاری بوو، چونکە ئێرانییەکان خۆیان پێشکەوتنی لەشکرەکانی عوسمانی لە ئەوروپادا کارێکی گەورەی تێ کردبوون ژمارەیەکی زۆری نێرراو و سەرلێدەر پەیتا پەیتا بۆ سەردانیان دەهاتن تا رێز و نەوازشی خۆیان بەدەرباری شا و کاربەدەستە پایە بڵندەکانی پێشکەش بکەن، بەڵام هیچیان هەرگیز یارمەتییەکی کاریگەر و ڕاستیان دژ بەعوسمانییەکان نەدەدایە بەر بای گوێیان. بەپێچەوانەوە، چەندین نێرراوی ئەوروپایی داوای یارمەتی ئێرانیان دەکرد بۆ پێکهێنان و سازدانی شالاوێکی خاچپەرستانەی نوێ بۆ سەر تورکەکان.

پەراوێزی سەدەها دەستنوسی ئەرمەنییان یادنامەی ڕۆژانە باسی ئەو شوێن دەستە کاریگەرە دەکەن کە سەرکەوتنی عوسمانلیەکان لە ڕۆژئاوادا لە دڵ و دەروونی گەلانی ڕۆژهەڵاتدا نەخشاندبووی.

هەرکە چووە سەر تەخت، شا عەباسی گەورە و بەتوانا (١٥٨٥ - ١٦٢٨)، کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەیەکی نوێی هێز و دەسەڵات لەگەڵ تورکەکاندا. بۆ ئەم مەبەستە ئەو پێویستی بەیارمەتی و کۆمەکی سەرجەمی ئەو گەلانە بوو کە لە هەرێمەکانی نێوان نۆکەندی فارس و قەفقاسیادا دەژیان. هەروەها ناچار بوو بایەخێکی گەورە بەو سام و هەیبەتە بدا کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لای زۆربەی زۆری تیرە کوردەکان هەیبوو هەر بۆیە هەستا میر شەرەفەدینی مێژووناسی بەناوبانگی - کە لە هەمان کاتدا یەکێک بوو لە سەردارە ناودارەکانی بنەماڵەی شەرەفخان لە بتلیس - ڕاسپارد کە بەفارسی مێژووی خێڵە کوردەکان و بنەچە و بنەڕەتیان بنووسێتەوە. بێ گومان، مەبەستی ئەو لەم ڕاسپاردەیە ئەوە بوو، کە هەستی شانازی کوردەکان بەبناغە و بنەچەی دێرینەیانەوە بوروژێنێ و ئەو پەیوەندی و یەکیەتییەیان بێنێتەوە یاد کە لە کۆنەوە پشت بەپشت لەگەڵ ئێران و ڕۆژهەڵاتدا بوویانە و بەم جۆرە دڵیان لە ئیمپراتۆریەتی ئالی عوسمانی کرمێ بکا و لایان بیبێزێنێ. بەڵام وێ دەچێ ئەو خۆشییەی ئەو

هەنگاوەی شا عەباس زایاندویەتە دڵی خێڵە کوردەکانەوە، بەو کردەوە درندانە و توند و وێژانە نیوەچڵ بووبێ کە شا ناچار بوو دژ بەهەندێکیان بیخاتە کار، چونکە ئەگەرچی تەنها یارمەتی سوارچاکانی ئەم خێڵە بوو بەهۆی شکاندنەوەی ئەو هێرشە گەورەیەی کە لەشکری ئۆزبەگەکان لە ئاسیای ناوەندەوە هێنایە سەر باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران، کەچی ئەو هەر دوا بەدوای ئەوە بای دایەوە سەر کوردەکان، واتە هاوپەیمانەکانی دوێنێی خۆی. پاشای ئەردەهان[1] کە کورد بوو، لە پاداشتی ئەو یارمەتییەدا کە دژ بەئۆزبەگەکان دابووی داوای بەسەربەخۆ ناسینی وڵاتەکەی کرد لە لایەن ئێرانەوە کەچی لە ساڵی (١٦١٣)دا دەزگیر کرا و لە لایەن شاوە لە سێدارە درا.

وێ دەچێ مەتەڵی قەڵای دمدم کە یەکێکە لە داستانە هەرە مەزنە کوردییەکان لەم سەردەمەدا ڕێک خرا بێ. قەڵای دمدم کە قەڵایەکی سەختی لە گرتن نەهاتوو دەبێ، هی سەرۆکی کۆمەڵە خێڵی هەرتووشی دەبێ، گوێ ناداتە بانگەوازی شا بۆ خۆبەدەستەوەدان. لەشکری ئێران ئابڵووقەی قەڵاکە دەدا پیاو و ژن و منداڵ بەسەر شوورەی قەڵاکەوە ئێشکچییەتی دەکەن و هەموو هێرشەکانی لەشکری عەجەم پووچەڵ دەکەنەوە. بەڵام مانگ لە دوای مانگ ئازووقە و پێویستیی ژیانی ناو قەڵاکە دێنە تەواو بوون. لەشکرەکەی چوار دەور هەموو پەیوەندییەکی قەڵاکە لەگەڵ دەرەوەدا دەبڕێ و ئەو نامەبەرانەی کە بەدزییەوە هەوڵی دزەکردن و دەرباز بوون دەدەن تا بچن یارمەتی لە شوێنەکانی تری کوردستان بخوازن، دەگیرێن و یەکسەر لە سێدارە دەدرێن. عەجەمەکان خۆڵێکی زۆر لە بەردەم دیوارەکانی قەڵاکەدا کەڵەکە دەکەن تا بیکەن بەسپیر و هەوڵی هێرشێکی یەکلاکەرەوە بدەن. پیاو و ژنەکانی ناو قەڵاکە ئەگەرچی تینوویەتی و برسیەتی شپرزەیان دەکات، تا دوا هەناسە لەسەر دیوارەکانەوە شەڕ دەکەن. کچە هەرزەکارەکان لەسەر دیوارەکانەوە خۆیان

(1) DHerbelot: Bibiotbeque Orientale (1675) p. 511.

هەڵدەدێرنە ناو شیوە قووڵەکانی دەوروبەری قەڵاکەوە تا نەکەونە دەستی سەربازە ئێرانییەکان و ناموسیان بەرن. لە ئەنجامدا ئابڵووقەدەرەکان قەڵاکە دەشکێنن و دەچنە ناویەوە. ئەوانەی کە لە ناوەوە دەبن هەموو یان بەمردوویی یان لە هۆش خۆچوویی، لەبەر برسیەتی و تینوویەتی، دەکەونە بەردەستی سەربازەکان.

## کەریم خانی زەندی گورە پادشای هەموو سەرزەمینی ئێران

(١٧٥١ - ١٧٥٩)

هەشت ساڵی ئاگربەستی لێ دەرچێ، هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێران پەنجا ساڵی رەبەق بەشەڕ یەخەگیری یەکتر بوون (١٥٨٨ - ١٦٣٨). لە کۆتایی ئەم سەردەمەدا، هەردوو لا ئەوەندە شەکەت و شەلاڵ بوون و لە ئاکامدا نارەزایی و پەرێشانی ناوخۆ ئەوەندە پەرەی سەند، کە ناچار مان پەیمانێکی ئاشتی ببەستن. سنوورەکان هەروەکو جاران مانەوە و لەبەر ئەوەی بلندایی و نەویەتییە سروشتییەکانی زنجیرەی چیاکانی زاگرۆس و ئەرارات بەخەتی سنوور دانران، ئەم سنوورە تا شەڕی ١٩١٤ - ١٩١٨ وەکو خۆی مایەوە. تا هەشتا ساڵ دوای ئەو شەڕوشۆڕە، ئاشتی و ئاسایش لە رۆژهەلاتدا بەردەوام مایەوە و گەلەکانی ئەو مەرزوبوومە، زوو بە زوو وێرانەکانیان چاک کردەوە و زیانەکانیان پڕ کردەوە، بەلام تورکەکان چونکە هەموو ئەو تالان و بڕۆیەیان لەبەردا بوو کە لە ئاسیا و ئەوروپادا کردبوویان ناچار کەوتنەوە وێزەی خێلە کوردەکان و ساڵ بەدوای ساڵدا زیاتر تەنگیان پێ هەڵچنین. زۆرداری و ستەم، نارەزایی لە ناو خەڵکدا دەخولقێنێ. ئەو قسانەی لەسەر زاری سەردارێکی کوردەوە ساڵی ١٦٧٥ دەیگێڕنەوە نموونەیەکی ئاشکران بۆ ئەم مەبەستە:

«ئیمپراتۆری ئەم سەرزەمینەی خۆم منم نەک ئیمپراتۆری عوسمانی. لەوانەیە ئەو لە من بەهێزتر بێ، بەلام من لەو خانەدانتر و خاوەن کوانگرتم[١]». گەر بهاتایە و ئەم سەردارە کوردە هەندێ زیاتر بژیایە، بەچاوی خۆی دەیبینی ئەوەی ئەو گازندەی لێ دەکرد، لە چاو ئەوەدا کە لە دواییدا ڕوویدا، هەر شەکراو بوو.

---

(1) Relation de Doury Effendi
Ambassadeur de La Porte Ottomane Aupres deroi de Perse.
Traduit Du Turk ET Accompagn, e du, n Exrtait Du Journal De
Petits De La Croix Fils (1810) p. 95...

که نادر شا هاته سەر تەختی حوکمداریی ئێران (١٧٢٢ - ١٧٤٧) زنجیره شەڕێکی تازە لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتدا ڕوویدا (کە لە هەمان کاتدا بەدوا شەڕی نێوانیشیان دەژمێرڕێ). بەڵام ئەمجارەیان زۆربەی هۆزە کوردەکان بەلای ئێراندا شکا بوون. دوا بەدوای ماوەی حوکمڕانیی بەهێز و توانا بەڵام کەم خایەنی نادر شا ئاژاوە و پاشا گەردانی سواری کۆڵی هەموو سەرزەمینی ئێران و قەفقاسیا و ئەو ناوچانەی عوسمانییش بوون کە بەدەم ئەو مەرزوبوومەوە بوون. ئەوانەی چاویان لە تەختی پادشایی بوو، هەروەها سەرۆک هۆزە دڵ پڕ لە ئاوات و خۆزگەکان، دیسانەوە ولاتەکەیان کردەوە بەمەیدانێکی گەورەی ململانێ و پێکدادان.

ساڵی (١٧٥٠) مەردان خانی سەرۆکی هۆزەکانی بەختیاری جاڕی شایەتی بۆ خۆی دا. کوردێکی تر، واتە کەریم خانی زەند بوو بەسەرکردەی لوڕستان و بۆ بەرەنگاری کردنی شالاوی ئەفغانەکان، چووە پاڵ مەردان خان... بەڵام ئەوەندەی نەبرد، سەری دوو بەران لە مەنجەڵێکدا جێی نەبووە و هەردوو سەرۆک بۆ دەسەڵات و لەسەر گەپ گەپانێ کەوتنە گیانی یەکتر و بەکۆمەک و هامیاریی ئەرمەنییەکانی جولفا (نزیکی ئەسفەهان) تای تەرازووی کەریم خان گران بوو و لەشکر ئەوی دانا بەتاقە پادشای هەتا هەتایی. لەو ماوەیەدا کە کەریم خان لەسەر تەخت بوو، خوارووی ولاتی کرد بەمەڵبەندی حوکمفرمایی و شیرازی کردە پایتەخت. واتە ئەو هەرێمەی کە بنەماڵەی هەخامەنشی و ساسانییەکانی لێ پەیدا بووبوو. بەیارمەتی سوارە دڵسۆزە لوڕ و بەختیاری و عەرەبەکان، کەریم خان دوو نەیاری گەورەی لەناوبرد و نزیکەی بیست ساڵی هێمنایەتی و لاشەڕی بەئێران بەخشی. پاش مردنی، لوتف عەلی خان، کە ئەویش سەردارێکی تری هۆزەکانی لوڕستان بوو، چووە سەر مەکۆی سەرکردایەتی. بەڵام قەجەرەکان کە هۆزێکی تورکمان بوون و تارانیان کرد بوو بەمەڵبەندی خۆیان و بەرە بەرە خەریک بوون باڵی دەسەڵاتیان بەسەر هەموو ئێراندا دەکێشا، لە لوتف عەلی خان ڕاست بوونەوە و جڵەوی دەسەڵاتیان لە دەستی دەرکرد.

ئەوە بوو ئەم سەرکردە کوردە پاش غافڵگیرکردن درایە دەستی ئاغا محەمەد خانی دامەزرێنەری بنەماڵەی قەجەرەوە و ئەمیش لە مانگی کانوونی یەکەم (دیسەمبەر)ی ساڵی ١٧٩٤دا پاش هەڵکۆڵینی هەردوو چاوی کوشتی. لە ترسی سەرهەڵدانەوەی سەرلەنوێ کوردان لە خوارووی ئێران و لورستان و سەرزەمینی بەختیاری، پادشاکانی قەجەر لە تاران بەوپەڕی دڕندەییەوە ڕەفتاریان لەگەڵ نەوە و خزم و کەسوکارەکانی کەریم خاندا کرد. هەموویانیان بەئاشکرا و بەبەرچاوی خەڵکەوە لە مەیدانەکاندا هەڵواسی یان بەدزییەوە لەناویان بردن. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە ئیتر هۆزە کوردەکانی ئێران، تا ئەم دواییە، جارێکی تر وەکو هێزێکی سیاسی سەریان بلند نەکردەوە و لە گۆڕەپانی بارودۆخی سیاسیی ئێراندا نەهاتنەوە ڕوو (ه).

## جوگرافیای کوردستان له سەردەمی نوێدا

ئەو سەرچاوە ڕەسمییانەی عوسمانییەکان دەربارەی دابەشکردنی ئیداری ویلایەتەکان کە بەدەستەوەن هەم پڕن لە کەموکوڕی و هەم لەگەڵ یەکدا نەگونجن. پاش ئەوەی عوسمانییەکان ناوچەکانی ڕۆژهەڵات (عێراق، کوردستان، ئەرمەنستان، گورجستان)یان لە نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەیەمدا داگیر کرد، سنوورەکان ئەوەندە گۆڕان و ئەمدیو و ئەودیوبان پێ کرا، کە پیاو نە دەتوانێ بیانژمێرێ نە دەستنیشانیان بکا. ئەم گۆڕانانە تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، لەسەر ویست و خوایشتی حوکمڕانە ناوخۆییەکان بوو، بەڵام لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە ئەم ویست و خوایشتە ئامانجی سیاسیشی هاتە پاڵ. دەسەڵاتی بەربڵاوی هۆزە کوردەکانی ئێران لە سەرانسەری بەشێکی زۆری سەدەی هەژدەیەمدا و ئەو کارە وروژێنەر و توندەی کە ئەمە دەیکردە سەر کوردەکانی سەرزەمینی عوسمانی بووبوون بەمایەی دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەکی گەورە بۆ دەوڵەتی عوسمانی. بۆیە «دەرگای بڵند» کەوتە لەسەر ڕا دابەشکردنەوەی بەڕێوەبەرایەتی لە سەرانسەری ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات و باکوردا کە بەدەم ئێران و ڕووسیاوە بوون، ئامانجی هەرە گەورە و سەرەکیی ئەم دابەشکردنەوەیە وەکو دەردەکەوێ خنکاندنی حکومەتە پشت بۆ پشت هانووەکانی کوردەکان بوو لەم ناوچە بەڕێوەبەرایەتییە نوێیانەدا بۆ ئەوەی ئاست و پلەی بەڕێوەبەرایەتییە پاشاکانی کورد کەم بکەنەوە و بیانکەن بەبەڕێوەبەری ئەوتۆ کە لەگەڵ ناوچەکانی تری دەوڵەتی عوسمانییدا هیچ جیاوازییەکیان نەبێ و بەم جۆرە دەسەڵاتی ڕاستەقینە و کاریگەر بخەنە دەستی ئەو سێ پاشایەتییەوە کە لە بەغدا و دیاربەکر و ئەرزەڕۆم دایان مەزراندن. لە پلەی بەڕێوەبەرایەتییدا، ئەم سێ پاشایەتییە پایەی یەکەمیان هەبوو، پاشاکانیش دەبوو بەڕەگەز تورک بن:

**أ- پاشایەتی بەغدا** (و):

ئەم پاشایەتییە سەرزەمینی دێرینی گۆتۆ کە مەڵبەندی ئەسلیی ڕەگەزی کوردە، کاشووی دێرین کە سەرزەمینی کاشییەکانە و هەڵەتەکانی دەم سنوورەکانی ئێرانی دەگرتەوە... هەروەکو ڕۆژگاری سەردەمی سۆمەری و بابلییەکان، هۆزە گرنگە پشت بەدوای پشتداهاتووەکان هەندێ جار سەربەخۆیی تەواو و هەندێ جار سەربەخۆیی نیوەچڵیان هەبوو لە مەڵبەند و سەرزەمینە چیاییە سەختەکاندا، کارستن نەیبوور[1] کە گەڕیدەیەکی چاو ژێرکەرەوە و وریا و وردکار بووە و ساڵی (١٧٦٣ - ١٧٦٤) لە بەغداوە بۆ موسڵ و ماردین و دیاربەکر بەگەشت چووە، نووسیویەتی کەوا ناوچەی قەڵاچوالان (نەک قەرەچوالان) لە لایەن پاشایەکی سەر بەبنەماڵەی سۆرانەوە کە بەشێکە لە کۆمەڵە هۆزی مەزنی بابان (ز) حوکمڕانی دەکرا و کەوا میرنشینی شارەزوور گەلێ جێگەی لێ قرتێنرا بوو و بچووک کرابووەوە و قەڵای گولعەمبەر کە سەردەمانێک نیشتەمەنی ئاغا و میر و بەگی بەسام و هەیبەتی کورد بوو، بووبوو بەوێرانە و بەدەستی شا عەباسی سەفەوی نزیکەی سەد ساڵ لەوەوبەر داری بەسەر پەردوویەوە نەهێڵرا بوو و جێ و ڕێ و خانومانی میری کۆیسەنجەق و دەوروبەری کە دەکەوێتە سەر زێی بچووک لەمە باشتر نەبوو. ئەگەرچی ئەم میرە هێشتا بەناوە دەسەڵاتی بەسەر کاربەدەستە کوردەکانی هەولێر و ئاڵتوون کۆپریدا هەر لە کاردا بوو. نەیبور ڕاگوزارانە باسی ئەوە دەکا کەوا ئەم پاشایەتییە کوردانە سەردەمانێک سەربەخۆ بوونە و پەیوەندییان یەکسەر بەخەلیفەی عوسمانی خۆیەوە بووە، بەڵام ئەو کاتەی ئەو لە ناوچەکە بووە، پاشاکانی بەغدا ئەو سیستەمی ئۆتۆنۆمییەیان هەڵوەشاندۆتەوە کە کاتی خۆی مەلا ئیدریس بۆ هۆزە کوردەکان دایڕشتبوو و ئێستا پلە و پایەی سەرۆکیی هۆزەکانیان بەفرۆشتن بەو پیاوماقوڵانە دەفرۆشت کە زۆرترین پارەیان دەدا،

(1) Carsten Nibuhr: Reisebescbreibungen Nacb Arabien und underen umligenden lan dern 1774 - 1837 vol. II. p. 127 Sqq.

هەروەها دەڵێ کەوا هێزێکی گەورەی یەنیچەری لە ئەستەمبووڵەوە رەوانەی هەولێر و لەوێ جێگیر کرابوو گوایە بۆ ئەوەی ئاسایشی رێگا سەرەکییەکان بپارێزێ بەم جۆرە ئەو هۆزانەی کە سەردەمانێک جڵەوی کاروباری سەرزەمینی خۆیان بەدەستی خۆیانەوە بوو، ئێستا کە ئاسایشە و شەڕوشۆڕ لە ئارادا نییە و دەوڵەت پێویستی پێیان نییە، دەبێ مل کەچ بن بۆ لەشکری بێگانە. ئەو کاتەی ئەم گەڕیدەیە بەسەرزەمینەکەدا بووری، ئەدیابینی دێرینە، واتە ئەو زەویزارە پان و بەرینەی دەکەوێتە نێوان هەردوو زێوە، بووبوو بەبیابانێکی چۆڵ و هۆڵ. یەزیدییەکان، لە بنار و پێدەشت و دۆڵەکانی دەوروبەری چیای سنجاردا هێشتا هەر بەدەسەڵات بوون و مافی حوکمفەرمایی خۆییان هەر بەدەستەوە بوو:

**ب- پادشایەتی دیاربەکر:**

ژوورتر لە پاشایەتی بەغدا، واتە لە باکور و رۆژئاوای رووباری دیجلە هۆزە کورد و یەزیدییەکانی ماردین و تورعابدین گوێیان لە داد و فیغانی ئەستەمبووڵ بۆ پێشکەشکردنی باج و پیتاک کەڕ دەکرد، لە کاتێکدا مەڵبەندی هۆزی ناوداری یەزیدیی میهرانی (کە ئێستا بەملی بەناوبانگن) لە دەوروبەری وێرانشەهر بووبوو بەوێرانە و خاپوور کرابوو، بەمبەر و ئەوبەری رووباری دیجلەوە، لە باکوری موسڵ، کۆمەڵە هۆزەکانی دەوری ئامێدی، زێبار، دهۆک و زاخۆ هێشتا ناو و پلە و پایەی بنەماڵەیی پشت بەدوای پشتدا هاتوویان هەر مابوو و بەسەر ناوچەکانیاندا هەر دەسەڵاتفەرما بوون، بەدرخانییەکانی جزیرەی ئیبنی عومەریش هێمان لەمانیش بەدەسەڵات و وسام و سێبەردارتر بوون.

بەڵام سیاسەتی پاشا عوسمانییەکان وا بوو، ئەمڕۆ پشتی سەردارێکی کوردیان دژ بەیەکێکی تر دەگرت و سبەی پشتیان لەم دەکرد و دەستیان بەباڵی ئەوی ترەوە دژ بەم دەگرت. ئەم رەفتارەیان نەک تەنها لە نێوان بنەماڵە خاوەن رەگ و بنەچەکاندا پەیرەو دەکرد، کە لە دێرزەمانەوە جڵەوی

دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکانیاندا بەدەستەوە بوو، بەڵکو هەمان شێوە و شێوازیان لەگەڵ هۆزە کۆچەر و ڕەوەند پیشەکانیشدا بەکار دەهێنا. بەم جۆرە لە لایەکەوە هەموویانیان دادەدۆشی و ئەو خەرج و پیتاکەی پێویستیان بوو، لێیانیان دەردەکرد. لە لایەکی تریشەوە، هەرگیز نەیاندەهێشت پێکەوە بنووسێن و یەکگرن. ئەمان، واتە پاشاکان، تۆزقاڵێک چییە بەتەنگی ئەوەوە نەدەهاتن کە ئەم سیاسەتەیان دەبووە مایەی چۆڵبوونی وڵاتی سوڵتان و بوونی بە بایانی ئەوتۆ کە هەناسە کێشی تێدا هەڵنەکا. مەڵبەندە یەزیدی و زازا و کورد و ئەرمەن نشینەکانی ناوەڕاستی تۆرۆس لەبەر سەختیی و دوور دەستی لە خەڵکی تر بەختەوەرتر بوون. تا ساڵی ١٩٣٨ قەڵا چیاییەکەی دەرسیم هەر بەسەربەخۆیی و دەست لێ نەدراوی مایەوە، هەر لە لوتکەی چیاکانی تۆرۆسەوە کە پشتیان لە شاری خەربەرد (ئەلعەزیزی ئێستا) گرتووە و دەشتەکانی گاپان مەعدەن و ئەرغەنیان گرتۆتە باوەش تا دەگاتە ساسۆن و فارقین، هۆزە کوردەکان بێ هیچ گیروگرفت و لە لایەن دەوڵەتەوە، تا سییەکانی سەدەی ڕابردوو بەئاسوودەیی دەژیان.

**ج- پاشایەتی ئەرزەڕۆم[1]:**

سنووری ئەم پاشایەتییە بریتی بوو لە ویلایەتەکانی تەرابزۆن، سیواس، دیاربەکر و، لە پلە و پایەی پاشایەتیدا دووەم یان سێیەم بوو[2]. ئەو ئیماراتە کوردانەی کە مەلا ئیدریس لە چالدێر و قارس بناغەی دارشتبوون، لە شەڕە سنووردا هەڵوەشێنرابوونەوە. بەڵام لەو شوێنانەدا کە

(١) تاکو نگریسی ساڵی ١٨٧٨ی بەرلین لەجیاتی هەرێمی پاشایەتی ئەرزەڕۆم، ئەرمەنستانی مەزن. کە لە نووسراوە کلاسیکییەکاندا ئەرمینیا ماگنای پێ دەوترێ بەکار دەهێنرا.

(٢) لە ساڵی (١٥٣٤ - ١٥٣٦)ەوە کە لە لایەن عوسمانییەکانەوە داگیر کران، بنەماڵە کورد و ئەرمەنییەکان حوکمڕانی شارەکانی ئەخلات، قارس، بایەزید، وان، بتلیس، موش، کیغی و ئەرزنجانیان دەکرد.

دوور بوون لە دەستی سوپای عوسمانی بنەماڵە دەسەڵات بەدەستەکان دوا بەدوای ساڵی (١٧٥٠) دەسەڵاتیان دیسانەوە گرتەوە دەست. قەڵایچکەی ئەخلات، پایتەختی (شاهی ئەرمەن)[١] هەروەکو قەڵاکانی ئەرجیش و بیرگری کە هەموو دەکەونە سەر کەنارەکانی ژوورووی گۆلی وان، ئەوەندەیان لەشکری تورک پێدا تێپەڕ بووبوو کە لە ئاسەوار و وێرانە بەولاوە هیچی تریان لێ بەدی نەدەکرا، هەرچی قەڵا بەردینە سەخت و هەیبەتدارەکەی بایەزید بوو، کە دەکەوێتە پاینی چیای ئەراراتەوە لە لایەن بنەماڵەی بەهلوول پاشاوە حوکمڕانی دەکرا کە بەڕەچەڵەک ئەرمەنی بوون و ئەوەندە فەرمان و دەسەڵاتی پاشای ئەرزەڕۆمیان بەهەند وەرنەدەگرت. شاری وان و قەڵا بەناوبانگەکەی، کە سەردەمێک پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ئۆرارتووی ئەرمەنی بوو لە لایەن میرەکانی وان خۆیانەوە حوکمڕانی دەکرا و سەردارەکانی یەزدی شێر دەسەڵاتداری بوون. ئەم خێزانە میرزادەیە، لە بنەچەوە لە هەکاریەوە هاتبوون، واتە ئەو زنجیرە چیایەی کە سەرێکیان لە ئازەربایجانی ئێراندایە و، جگە لەوان هەر لە ناو ئەم چیایانەدا گاورە ئاسوورییەکان لە ژێر سەرۆکایەتی مارشەمعونی پەترياركیاندا و بەپاڵ هەردوو هۆزی شکاک و هەرتووشییەوە دەژیان. کە موورادی پێنجەمی دوا سوڵتانی مەزنی عوسمانی (١٦٣٢ - ١٦٤٠) سەردانی هەرێمەکەی کرد فەرمانێکی زۆری بەمیر و حوکمڕانەکانی ئەم قەڵا ئەرمەنییانە بەخشی و بەگوێرەی ئەو فەرمانانە میرەکانیان لە گەڵێ باج و خەراج بوێرراند و هەندێکیان تا ئەم سەردەمانەی دوایی هەر کارا بوون.

دۆڵە دڵگیر و زۆزانییەکانی ناو چیاکانی خوارووی وان، کە بەدۆڵی مۆک (مۆکسینی دێرین) و شەتاخ (کۆردۆخی ژووررووی سەردەمی ئەرمەنستانی مەزنی کۆن) بەناوبانگن، بەدەستی بنەماڵەی ئەڤداڵ خانەکانەوە بوو کە لە خۆیان ژوورتر هیچ ژوور دەستێکیان نەدەناسی.

---

(١) لە سەدەی دوازدەیەمدا بەپادشاکانی ئەرمەنستان دەوترا (شاهی ئەرمەن).

ڕۆژئاوای گۆلی وانیش، واتە دەوروبەری بتلیس، مەڵبەندی میرنشینی شەرەفخانی خاوەن دەسەڵات بوو کە بەشێک بوون لە کۆمەڵە هۆزی ڕۆژەکی کە بەبنەچە دەچنەوە سەر بنەماڵەی خانەدان و ئەریستوکراتی ڕەشتۆنیکی ئەرمەنی. ناوچەکە بەناو سەر بەپاشایەتی مووش بوو، لە سەردەمێکی تردا بنەماڵەی عەلادین بەگی بابونت هەموو ئەو ناوەیان لە ژێر ڕکێفدا بوو و ئەم ناوچەیە ئەمبەر ڕووباری (موراد سو)ی دەگرتەوە (کە لقی ڕۆژهەلاتی ڕووباری فوراتە).

بەگە کوردەکان و میرزادە ئەرمەنییەکانی ساسۆن و خویت ستوونی سەرەکیی ئەم حکومەتە نیمچە سەربەخۆیەی مووش بوون و تا ئەم سەردەمانەی دواییش تەنانەت سێبەری تورکیش چییە، هەرگیز بەولاتەکەدا گوزەری نەکردبوو.

# فەسڵی چوارەم

## هەڵگەڕانەوەی کوردان لە عوسمانییەکان

## ١٨٣٠ - ١٨٧٤

«ڕاستییەکی ڕوون و ئاشکرایە کەوا لە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانییدا هەندێ هەرێمی یەکجار پان و بەرین هەن کە دەوڵەت بەهیچ جۆرێک دەستی تێیاندا ناڕوات. بێ یەک و دوو، پادشا (سوڵتانی عوسمانی) ناچارە چەند هەرێمێکی گەورەی ناو سنووری دەوڵەتەکەی سەرلەنوێ بخاتەوە ژێر ڕکێفی خۆی. یەکێک لەم هەرێمانە ئەو بەرزاییانەی (کوردستان)ە کە دەکەوێتە نێوان ڕووباری دیجلە و سنووری ئێرانەوە»(١)

قۆن مۆڵتکە

ڕەشەکوژکردنەکەی ساڵی (١٨٢٦)ی یەنیچەریەکان لە ئەستەمبووڵ و دوا بەدوای ئەوە گوشار خستنە سەر (وەجاغ)ەکانیان لە سەرانسەری وڵاتی عوسمانییدا لە لایەن دەوڵەتەوە و پێکهێنانی لەشکرێکی یاسادار و هێزێکی میلیشیا لە جێی ئەوان لە خۆیدا گۆڕانکارییەکی گەورە بوو کە نیشانەی خراپە و ڕۆژە ڕەشی بۆ کورد بەخۆیەوە هەڵگرتبوو. پلانەکە، بەو جۆرەی سازدرا بوو - هەرواش شکایەوە - بۆ ئەوە دانرابوو کە دارەڕای پێشووی شێوەی حوکمفەرمایی دەوڵەت هەڵوەشێنێتەوە و هەر شتێک کە چاکەی کوردی تێدا بێ لە ڕەگەوە هەڵیکێشێ. ئەم ڕیفۆرمکارییەی دەرگای بڵند جارێ مەرگی سیستەمی دەرەبەگایەتی گەورەی دەدا، ئەو سیستەمەی کە کورد بەچاکترین و لەبارترین سیستەمی کۆمەلایەتی دادەنێن بۆ خۆیان.

(1) Helmuth von Moltke: Briefe uber Zustande und Bege benheiten in der Turkei, aus den jahren 1835 bis 1839.

شـان بـەشـانی ئـەم هەولانە بۆ چاکـسـازی، وەزعـی ئیـمـپـراتۆریەت لە خراپەوە بۆ خراپتر چوو و کارەساتی بەدوای کارەساتدا بەسەردا دەهات: سەرکەوتنی یۆنانییەکان لە شەڕی سەربەخۆییدا (١٨٢٨)، بەزین و سەرەنجام شیرازە پسانی سەراپای دەوڵەت لە شەڕی ڕووسدا (١٨١٨ - ١٨٢٩) و دوا بەدوای ئەوە ڕێککەوتننامەی بەندەری ئەنکیار (١٨٣٣) کە تورکیای بەتەواوی خستە ژێر ڕکێفی ڕووسیاوە، ئینجا هێرشە سەرکەوتووەکەی لەشکرە بچووکەکەی برایم پاشای میسری کە تا نزیک دەرگای ئەستەمبووڵ نەوەستایەوە، هەموو ئەمانە پێکەوە سەرلەنوێ ئاگری ئارەزووی سەربەخۆیی یەکجارەکییان لە دڵی هەندێ سەرداری کورددا هەڵگیرساندەوە. ئەگەر یۆنانییەکان و میسرییەکان کە هەردوو لا جاران نۆکەری ئەڵقە لە گوێی بەردەرگای سوڵتان بوون بتوانن لەشکری عوسمانی ببەزێنن و تار و ماری کەن، ئەی گوایە کوردان چییان لەوان کەمترە هەروا بەژێردەستەیی بمێننەوە؟

ڕاستییەکەی پیاو هەرگیز ناتوانێ بەو کارە بڵێ هەڵگەڕانەوە کە کورد لەم دەمەدا کردیان. ئەوان نەیاندەویست باج بدەن بەڕۆمییە بەزیوەکان. سووک و ئاسان دەیانویست ناوچەکانی خۆیان کە پشتاوپشت هی خۆیان بوو، خۆبەخۆ و بەگوێرەی ئاواتی خۆیان حوکمڕانی بکەن. خۆ ئەگەر بەپێودانگی دەوڵەتێکی ڕێکوپێک قسە بکەین، هۆزە کوردەکان لە گێژەنگی ئاژاوە و شیرازە پساویی درێژخایەن لە ناو هەردوو ئیمپراتۆریەتە هاوسێکەدا هەمیشە لە یاخیگەری بەردەوامدا بوون. هەر دوا بەدوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی ساڵی (١٨٢٩)ی ئەدریانۆپل لەگەڵ ڕووسیادا، دەرگای بڵند دەرفەتی سەند و ئەو سوپا ڕێکوپێکەی گەیاندبوویە سەر سنوورەکانی ڕۆژهەڵات بۆ سەر کورد بادایەوە بۆ سەرکوت کردنی حوکمڕانە خۆولاتییەکان و، لەجیاتی یەکە یەکەیان پاشای تورک ڕەگەزی دانا.

ماردین یەکەم شار بوو کە ئاڵای شۆڕشی دژ بەم شێوازە تازەیە و بۆ

هێشتنەوەی وەزعی پێشوو هەڵکرد. هەرچی بەئەوروپایی دادەنرا شەقی تێ هەڵدرا و لادرا و ئەو بەرگە سەربازیە تازەیەی داهێنرا بوو بەنیشانەی هەموو بەدبەختییەکان دانرا[1]. شالآوی تورکەکان بۆ دامرکاندنەوەی هۆزەکان لە دوو قۆناغی جیا جیادا کرا. یەکەمیان لە ساڵی (١٨٣٤)ەوە تا ساڵی (١٨٣٩)ی خایاند ئەو کاتەی لە نەزیب و لە ناو دۆڵ و دەرەی کێوەکانی ئەمانۆسدا سوپای عوسمانلی لە لایەن میسرییەکانەوە بەفەرماندەیی ئیبراهیم پاشا تەفروتونا کرا و ئەوە بوو تا سێ ساڵ دوای ئەوە لەشکری عوسمانی نەهاتەوە خۆ. دووەمیان لە ساڵی (١٨٤٢)ەوە تا ساڵی (١٨٤٧)ی خایاند. هەردوو شالآوەکە بەشێوازی دێرینەی تورکان واتە خوێن ڕشتن و ئەشکەنجەدانی هەزارەها کوردی بێ گوناه بەژن و منداڵ و پیر و پەککەوتەوە، بەڕوخاندنی سەرتاسەری چەند هەرێمی کوردنشین بەتەواوەتی و ئاوارە وماڵوێران کردنی خەڵکەکەی ئەنجام درا[2].

لە شالآوی یەکەمدا محەمەد ڕەشید پاشای فەرماندەی لەشکری عوسمانلی لە دیاربەکر کە ئەو کاتە پایتەختی کوردستان بوو، لەشکرێکی تەواوی لە «هێزە نیزامییەکان» و «پاسەوانان» و «سوارە» و «تۆپخانە» پێکەوە نا ئەم «یاخیبوونەی» کوردان دامرکێنێتەوە. جێی داخە کەوا هەندێ سەرۆکی چڵکاوخۆر دژ بەگەلی خۆیان کەوتنە تەک لەشکری تورکان. ڕەشید پاشا لە سیواسەوە دەستی پێ کرد و سەرەتا هێرشی بردە سەر خێڵی میهرانیی یەزیدی لە وێرانشەهر و چیای سنجار و شەڕ دوو ساڵی ڕەبەقی خایاند چونکە یەزیدییەکان خۆڕاگرییەکی زۆر توند و بەتینیان نواند لە دەستی دڕندەیی و لە خوا نەترسیی تورکەکان، سەرۆک هۆزەکان خۆیان و ماڵ و منداڵ و ئاژەڵیان بۆ لوتکە و بەندەنە سەختەکان و شوێنە قایمەکان کشانەوە، تا کەی و لە هەر کوێ جێی دەست بوو پەلامار

(1) Wiggiam Ainsworth and H. Rassam Notas on a Journey from Constantionple to Mosul in 1830 - 40. In the Journal of the Royol Geogr. Society (1840) P. 324.

(2) Von Moltke - Brief...

دەن و دەست بوەشێنن، بەڵام هۆزە کۆزانەکان، هەروەها تورکمانەکان ناچار کران باجی ساڵانە و سەرباز بدەن بەدەوڵەت. ساڵی ١٨٣٦ ڕەشید پاشا بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ سەر هۆزەکانی دەم ڕووباری دیجلە ملی نا، چەند مانگی ڕەبەق هەوڵیدا دەست لە ناوچەی جەزیرەی ئیبنی عومەر بوەشێنێ کە مەڵبەندی سەرەکیی بنەماڵەی مەزنی بەدرخانییەکان بوو، میر بەدرخان بەگ دەستی چاکی لێ وەشاندن، تا ناچار ما ڕوو بکاتە چیای جودی و لەوێ خۆی قایم بکا. لەم کاتەدا لەشکری تورک بەتەکخستنی هەندێ سەرۆکی خێڵی کورد، کە بەرامبەر بەپلەی پاشایەتی پێش قەرەوڵییان بۆی کرد دژ بەبرا و کەسوکاری خۆیان بەرە بەرە بەهێزتر دەکرا، ئەوانەی ڕووداوەکانیان بەچاوی خۆیان بینیووە وایان یاداشت کردووە کە بەدرخان بەگ ناچار نەدەبوو پەنا بەرێتە بەر چیاکان و سەرزەمینەکەی خۆی چۆڵ بکا، ئەگەر خان مەحموودی هاوپەیمانی کە لە باکوورەوە داکشا بوو و نزیکەی بیست هەزار چەکداری کورد و ئاسووری لەگەڵدا بوو، بیتوانیایە بەخێرایی لە پردەکەی خەسخەرەوە لە ئاوی بۆتان بپەڕێتەوە بەر لەوەی لەشکرێکی تری تورک بەفەرماندەیی حافیز پاشا پردەکە بەتۆپ وێران بکا. هێزەکانی خان مەحموود هەوڵیان دا لە بوارەکەی نزیکی تیللۆوە بپەڕنەوە لەو جێگایەی ڕووباری دیجلە و بوهتان لێک دەدەن کە لە بەهاردا دەبێ بەگۆمێکی قووڵ. هەردوو لا لێرەدا بەرەنگاری یەک بوون و شەڕێکی یەکجار سەخت ڕوویدا.

«سوارەکانی خان مەحموود وەکو ڕەشەبا بەخەنجەر و ڕمی درێژ هێرشیان دەبردە سەر هێزی نیزامی عوسمانییەکان. بەڵام لەشکری عوسمانی خاوەنی تفەنگ و تۆپخانە بوو بۆیە سەرەنجام کورد خۆیان بۆ ڕاگیر نەکرا»(١).

کە نەیتوانی بگا بەفریای بەدرخان بەگدا، خان مەحموود بەلەشکرەکەیەوە گەڕایەوە دواوە و لە زنجیرە چیای ئاردۆسدا - زنجیرەی

---

(١) لە ڕاپۆرتێکەوە وەرگیراوە کە ا. مانۆگلی نووسیویەتی. مانۆگلی ڕاوێژکارێکی ئەرمەنی بووە و ڕاپۆرتەکەی لە دەستنووسەکەی چ. پیرگالامیاندا دۆزراوەتەوە.

دووەمی خوارووی گۆلی (وان) - خۆی قایم کرد. ڕەشید پاشا لە دیاربەکر بەگرانەتا مرد. هەروەها زۆربەی لەشکرەکەی بەم دەردە قری تێ کەوت. حافیز پاشا کە لە جێگای ئەو دانرا بەرەگەز چەرکەز بوو و لە کۆشکی سوڵتاندا پێ گەیشتبوو، وەکو قەفقاسییەک کوردی باش دەناسی و هەرچی ناپەسەندی و سەگیی لە خۆیدا شک دەبرد، بۆ چاندنی تۆوی دووبەرەکی لە نێوان هۆزەکاندا بەکاری هێنا و چ بەبەرتیل و چ بەوادەی پلە و پایە هەوڵیدا بەلای تورکەکاندا بیانکێشێ، سەرەنجام توانی ناکۆکی و ڕقەبەرێ بخاتە نێوان سەرۆکە هەرە گەورەکانەوە لەوانە بەدیع (ڤێدی) خان بەگی شێروان (باکوری ئاوی بۆتان) و محەمەد پاشای کورد کە هەردووک کەوتنە پاڵ لەشکری عوسمانی و یەخەگیری برای خۆیان بوون.

## پاشا کوێرەی ڕواندز (١٨٣٦)

میرە کوێرە یاخو (محەمەد پاشا)[١]، بەگی ڕواندز گەورەترین تەگەرەی بەردەم هێزەکانی عوسمانی بوو. قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئەم میرە هەموو ناوچەی ڕواندزی دەگرتەوە واتە ئەو ناوچە شاخاوییەی دەکەوێتە نێوان زێی گەورە و سنووری ئێرانەوە. کەڵەمێردترین و هەڵمەتترین سەرکردەی قۆناغی یەکەمی هەڵگەڕانەوەکە دژ بەدەوڵەتی عوسمانی ئەم پاشایە بوو. دەست و دەسەڵاتی هەر لە دەم ڕووباری دیجلەوە تا دەگەیشتە وڵاتی شنۆ لە ئازەربایجانی ئێران دەڕۆیشت. نەک هەر ئەمە، قەڵا کوردنشینەکانی ئامێدی و زاخۆش هەموو سەر بەم بوون[٢]. ئەو خۆی لە هۆزی ڕەوەندی بوو و خۆی وا دەناساند کەوا باو و باپیرانی لە سەردەمی سەلاحەدینی مەزنەوە هەر بەمیرایەتی هاتوونەتە خوارەوە. هێز و پشت و پەنای بریتی بوون لە هۆزەکانی سۆران و شکاک و هەرتووشی و لەبەر ئەمە بنەماڵەکەی هەمیشە لەسەر دەسەڵات دوژمنی بابانەکانی باشوور و بەدرخانییەکانی ڕۆژئاوا بوو. میرە کوێرە هەرگیز کەسی بەژووردەستی خۆی نەدەزانی. لە نوادا، سەرەڕای هەوڵ و تەقەلا و هێرشی چەند جارە، هێزەکانی عوسمانی بەهیچ جۆرێک زەفەریان بەپاشای کوێرە نەبرد، لە قەڵاکەیەوە کە وەکو هێلانەی هەڵۆ بەسەر لوتکەی چیایەکەوە بوو، پاشا خۆی بووبوو بەنموونەی ڕەشیدی و خۆڕاگرتن بۆ پیاوەکانی، ئەگەرچی چاوی چەپی کوێر بوو (هەر بۆیەش پێیان دەوت پاشا کوێرە)، نیشانچییەکی زەبەردەست و بەناوبانگ

---

(١) پاشا کوێرە ناوی محەمەد پاشایە و بەئایینیش موسڵمان بووە نەک یەزیدی. دکتۆر سافراستیان لەم بارەیەوە بەهەڵەدا چووە - وەرگێڕ -.

(٢) ایچ. سی. ڕۆلینسن: گەشتێک لە تەورێزەوە بۆ تەختی سولەیمان بەکوردستانی ئێراندا ساڵی ١٨٣٨ - لە لایەن ڤایکاونت پالمەرستونەوە دراوە بەگۆڤاری کۆمەڵەی شاهانەی جیوگرافی... جزمی دەیەم (١٨٤١) لاپەڕەکانی ١٧ - ٢٠.

H. C. Rawlison a journey from Tabriz through Persion kurdistan to the ruins of Takhti - Suleiman in 1838.

و یەکـاویەک پێک بوو لە تیـر ئەندازیـدا. دەرگـای بڵند فـەرمـانی بەپاشاکانی بەغدا و وان دا لەشکری نیزامی و باشیبوزغ پێکەوە بنێن و بچنە سەری و قەڵاکەی داگیر کەن، ئەوە بوو قەڵاکە گەمارۆ درا و ئاو و ئازووقـەی لێ بڕا تا پاشـا ناچار بوو خـۆی بداتە دەسـتـەوە بەمـەرجـێک ڕەفتاری ناشیرینی لەگەڵدا نەکرێ. سەرەنجام خۆی و خێزانی و سەرۆک هۆزە هاوپەیمانەکانی بۆ ئەستەمبوڵ دوورخرانەوە، لە لایەکی ترەوە، شاڵاو دژ بەهۆزە کـوردەکـانی تر لە بڵـنداییـیـەکـانی دەوروبەری سـاسـۆن و مـۆتکانەوە، واتە بەشی ناوەندی چیا بەرز و دۆڵە قـووڵەکـانی خوارووی شاری بتلیسـەوە هەر بەردەوام بوو، بەدرخانییەکان ئەوپەڕی مەردانەییان لە بەرگرییدا نیشان دا. ئەو لەشکرە هاوبەشە ئەرمەنی و کوردەی کە حاجی زولاڵ ئاغا سـەرکردەیی دەکرد ئـازایەتییـەکی بێ وێنەی دژ بەلەشکرەکانی عوسمانی لە لیـجەو نەرجیکی[1] نواند. ئەم کورد و ئەرمـەنیانە هەرگیز سەریان بۆ پاشا عوسمانییەکان نەوی نەکردبوو یان پوولێک چییە باجیان بەسـوڵتـان نەدابوو - ڕەجەب بەگی هازۆ، تەمـیـر بەگی هاینی خوارووی دیاربەکـر، لەگـەڵ هێـزەکـانی سـەرعـەسکەر (فـەرمـاندەی گـشـتی)ی عـوسمـانییـدا مێرانە پێکدا هەڵـپژان، بەڵام تورکەکان خاوەنی تۆپخانە بوون، کورد نەک هەر تۆپخانەیان نەبوو بەڵکو جۆرە شارەزاییەکیشیان لەم جۆرە شـەڕەدا نەبوو، ئەوە بوو تۆپـخـانەی تورکـەکـان کـەوتە کـار و قـەڵا و گـوندەکـانی یەک لە دوای یەک ئاگـر تێـبەر دا و وێران کـرد. ناچار کـورد کـشـانەوە و سـەرکـردەکـانیـان گـیـران و هەمـوو بۆ شـوێنی زۆر دوور دوورخرانەوە. لە پاسوور کە دوور دەسترین ناوچەی گوینجی دەم ڕووباری فـوراتە، ڕۆڵەکـانی هۆزەکـانی بەکـران و ڕەشکوتان، بەژن و پیـاوەوە، پاڵەوانانە بۆ پاراستنی ماڵ و شەرەفی خۆیان شەڕیان کرد. حافیز پاشا، وەکو سەرکردەکانی تری بەر لە خۆی، پاداشتی پارەی زۆری بۆ ئەو کەسانە

(1) James Brant: Notes on a Journey through a part of kurdistan in the summer of 1838, H. M. Consul at Erzerum, in Journal of the Royal Geographical Society, Vol x (1841) pp. 356 - 58.

دانابوو کە سەر و گوێ و ئەنگوستی کوردانی بۆ بهێنن، ئەوانەی بەدیل دەگیران ئەوپەڕی ئەشکەنجە دەدران، تەنانەت ژن و منداڵیش نەدەبوێرران. ژنانی کوردستان شان بەشانی برا و باوک و مێردەکانیان ئازایانە شەڕیان دەکرد. تەنانەت یەکێکیان بەخەنجەر ورگی چەند سەربازی تورکی دادڕیبووە خوارەوە(۱).

نزیکەی ساڵێک دوای ئەو خوێن ڕشتنە، لەشکری نیزامی عوسمانی بەسەرکردایەتی هەمان حافیز پاشا لە نزیک نزیب ساڵی (١٨٣٩) لە لایەن میسرییەکانەوە بەسەرکردایەتی ئیبراهیم پاشا تەفروتونا کرا و زۆربەی بەکوشت چوو. شێخی زیلان کە پیاوێکی ئایینی زانای کورد بوو ئەم شکستەی عوسمانییەکانی وا لێک دایەوە کە وا «داد و فیغانی ژن و منداڵە کوردە بێ گوناهەکان گەیشتە بارەگای خودا و ئەم دەردەی بەسەر ڕۆمی هێنا».

(1) Von Moltke: Briefe... op cit. Letters menthioned.

## میر بەدرخانی جزیرەی ئیبنوعومەر

## (١٨٤٢ - ١٨٤٧)

لە دووەم قۆناغی خەباتی گەلی کوردا بۆ سەربەخۆیی، بەدرخان بەگ وەکو جەنگاوەرێکی هەرە ئازا و دەوڵەتمەدارێکی ژیر و دووربین دێتە مەیدانەوە. سەرکەوتنەکەی بەسەر لەشکری عوسمانلییدا و دوا بەدوای ئەوە کشانەوەی بۆ چیای جوودی بەنیشانەی ئەم ژیری و دووربینییە دەژمێررێ. پوختەترین و باشترین زانیاری دەربارەی بەدرخان بەگ لە لایەن دوو موبەشیری ئەمەریکاییەوە[1] دراوە کە بەراسپاردە ساڵی ١٨٤٦ چوونە بۆ دەرگەوڵ (دەرگای گوڵان) و لەوێ سەریان لە بەگ داوە. هەردوو کابرای ئەمەریکایی لە ئێرانەوە کەوتوونەتە رێ و حوزەیرانی ئەو ساڵە گەیشتوونەتە خزمەتی. ئەوان بەم شێوەیەی خوارەوە لە بارەیەوە نووسیویانە: «نزیکی هەژدە میل لە رۆژهەڵاتی جزیرەوە دوور، بەوبەری رووباری دیجلەوە، دەرگوڵی نشینگەی بەدرخان بەگ شارۆچکەیەکی چەند سەد ماڵییە کە بەقوڕ و بەرد دروست کراون. شارۆچکەکە دەکەوێتە دامێنی چیای جوودییەوە. قەڵایەک بەسەر گردێکی دەم شارۆچکەکەوەیە. بەبەردەمیدا جۆگەیەکی باریک بەرەو دیجلە تەکان دەدا. زەڵەیەک کە لە ناو گۆڕەپانێکی نزیکەوە دەهات، سەرنجی راکێشاین. بەگ کە نزیکەی شەست یەزیدیی پاسەوانی تایبەتی خۆی و چەندین سەرۆک هۆزی کوردی بەدەورەوە وەستابوون، پارەی بەسەر سەدەها بێوەژن و منداڵ و نەخۆش و پەککەوتە و بێکەسدا دابەش دەکرد. ئەوانیش هەموو پەلیان بۆ ئاسمان پەل کردبووەوە و بۆ سەرکەوتنی و تەمەن درێژی ئەو لە خودا دەپارانەوە. بەدرخان بەگ زۆری شانازی بەوەوە دەکرد. کەوا خاوەنی «یەک قسە»یە. هەشت ساڵ بەر لەوە ئەو لاواز و بێ توانا بووە و تورکان بەهێز و

(1) Messrs wright and Breath in missionary Herald a Weekly published in Boston mass volume 42nd (1846) pp. 378 - 81.

دەسـەڵات، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێـسـتـا (١٨٤٦) ئەم تەرازووە بەتەواوی بەپێـچەوانەوە گـۆڕاوە کـەچی ئەو قـسـەی خـۆی نەشکاندووە. سـەروەت و دارایی بەگ لە ژمـاردن نەدەهات. دەسـەڵاتی هەر لە سنووری ئێـرانەوە دەیگرتەوە تـا ناوچەرگـەی مـیـزۆپۆتامـیـا. ناو و ناوبانـگی بەچوار گـۆشەی وڵاتەکەدا بڵاو بووبووەوە.

مەگەر بەدەگمەن ئەگینا سەردار نەبوو لە کوردستانی باکور کە مل کەچی فەرمانی ئەو نەبێ و هەموو بەدیاری ئەسپ و هێستر و شتی بەنرخی ترەوە دەهاتن بۆ دیدەنی و سـەردانی. تەنانەت یەکـێکی وەکـو نوروڵڵا بەگی هەکاری کە لە پلە و پایەی کۆمەڵایەتییدا تا بڵێی بەرز و سـەردەمانێک بگرە لەویش بەهێز و تواناتر بوو هەروەها خان مەحموودی موکس (موک) خۆیان بەبەختەوەر و شەرافەتمەند دەزانی بەوەی بێنە دیدەنیی و سەردانی و چاوەڕوانی فەرمانی بن... چارەنووس زۆری خزمەت بەپەرەدان بەهێز و توانا و درەوشـانەوە و بڵند بوونی ئەسـتـێـرەی بەخـتی ئەم و ئـیـفلیج کـردنی نەیارانی کـردبوو. گـەلێ لەو سـەردارانەی کـە سـەر بەو بوون، هەرچەندە سەرکەش و چەمووش و چاوەڕوانی هەل بوون کە جڵەوی کاریان بکەوێتە دەست، نەیاندەتوانی پەنجـەی لە ڕوودا بەرز بـکەنەوە و وەکـو بەزمـانی خـۆیان دەیان وت «خـودا داویەتی و بێـهـودەیە هەر ڕەنجێ بۆ لە دەست دەرکردنی بدرێ...»

تاوانبـار لە چنگی حکوومـەتی بەدرخـان بەگ دەرفـەتی دەربازبوونی نەبوو. بەرتیل خـۆری، بەلای ئەم و ئەودا شکان، کـە زۆر لەم وڵاتانەدا دەبنە کـۆسپ و تەگـەرە لە بەردەم دادپەروەرییـدا، لەوێ جـێگە و ڕێگەیان نەبوو... هەر کـوردێک دزی بکردایە و لەسـەری سـاخ بووایەتەوە کـە کردوویەتی یەکسەر دەستی دەقرتێنرا... ئەم ئاسایش و ئێمنییە لە کێویترین بەشی کوردستـاندا بەرپا بوو کە زۆر کەس بەمەڵبەندی دزی و جەردەیی و پیاوکوژی دادەنا، کاتێکی زۆری بۆ بەسەرکـردنەوەی ڕۆڵەکانی گـەلەکەی سەرف دەکرد. بەساغی و ڕاستییەوە هەموو فرمانەکانی ئایینەکەی بەجێ

دەگەیاند و تەنانەت لەوپەڕی سەرقاڵی و دەست گیراوییشدا فەرزەکانی نەدەچوون. ئەو ژمارەیەک یەزیدی چ بەباوەڕ پێ هێنان چ بەشمشێر هێنابووە سەر ڕێ»[١].

---

(١) بەپێچەوانەوە، ئەوەی زانراوە میر بەدرخان بەگ ڕێزێکی زۆری لە کوردە یەزیدییەکانی هاوسۆز و هاوپەیمانی دەگرت و هەر لەبەر ئەمە و لەبەر سەرڕاستی و ئازایەتیان زۆربەی پاسەوانەکانی لەوان بوون - وەرگێڕ -.

## پرۆگرامی سیاسیی بەدرخان بەگ

چ بەتەئسیری شەخسیەتی خۆی بێ، یان بەبەکارهێنانی زەبروزەنگ، بەدرخان بەگ زۆربەی سەرۆک هۆزەکانی ناوچەکەی خستبووە ژێر باڵی خۆیەوە. دەبێ ئەوە ڕەچاو بکرێ کە لە سەردەمانێکی دوور و دێرینەوە ئەم کوردانە بەردەوام لەگەڵ ئاسووری و کلدانی و ئەرمەنییەکانی ژوورتردا تێکەڵی و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیان بووە، بۆیە ئەمان هۆشیاری نەتەوەییان زیاتر پوختە و لە باری سیاسییەوە پێشکەوتووتر بوون لە زۆربەی گەلی دانیشتووی سەرزەمینی دێرینی گۆتۆ. واتە ئەو زنجیرە چیایەی دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی بچووک و ڕووباری دیالەوە. سەرەڕای ئەمە زۆربەی کوردی باکور پێکهاتبوون لە هۆزی کۆنە یەزیدی ئایین. گەلێکیشیان بەبنەچە گاور بوون. جا وای پێ دەچێ ئەم ڕاستیانە لە پێکهێنانی بنەمای پرۆگرامی سیاسی بەدرخان بەگدا دەستێکی باڵایان بووبێ. بەدرخان بەگ یەکەم هەڵوێستی ئاشکرای خۆی بەرامبەر بەدەوڵەتی عوسمانی بەسەرپێچی کردن لە بانگەشەی دەوڵەت بۆ سەربازدان بۆ شەڕی ڕووسیا لە ساڵەکانی ١٨٢٨ - ١٨٢٩دا دەرخست[1]. ئەو نەک هەر بەپیری داواکەی دەوڵەتەوە نەچوو، بەڵکو هەوڵ و دەوانێکی زۆریشی دا تا خان مەحموودی موک (موکس لە تورکییدا) و نوروڵڵا بەگی هەکاری بۆ ئەو نەخشەی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستانە بخاتە پاڵ خۆی کە خەریک بوو بەدڵ و بەگیان هەوڵی بۆ دەدا.

گرتنی یەک لە دوای یەکی قەڵا و قەڵایچە سەختەکانی کورد لە هێرشە بەناوبانگەکەی ساڵی ١٨٣٤ - ١٨٣٨ی عوسمانییەکاندا بۆ سەر کوردستان و ئەو ڕەفتارە دڕندانەیەی کە شان بەشانی هێرشەکە لەگەڵ ژن و منداڵی کورددا نواندیان بوون بەئەندرزەیەکی گەورە بۆ بەدرخان بەگ کە

---

(١) غ. فارد پیرگالییمان کە مێژووی ئەو ڕۆژانەی ڕۆژنووس کردووە و لە پێنج جزمدا نووسیویەتەوە.

تەنیا کاری و یەکدەستی بەرانبەر بەتورکەکان بێهودەیە و بێ ئەنجام. ئەو ئەڵهای دروستکردنی کوردستانی سەربەخۆ بوو لە چوارچێوەی ئەو سنوورەدا کە دوو موبەشیرە ئەمەریکاییەکان لە سەرەوە باسیان کردووە و ئەو خەیاڵەی لە مێشکدا پەروەردە دەکرد کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێ بەمیری هەموو سەرزەمینەکە لە ژێر دەسەڵاتی بەناوەی ئێراندا، ئەوسا دەسەڵاتی تەواو دەدا بەهەموو سەرۆک هۆزەکان، ڕێکخستن و ئارایشی دەوڵەتیشی دەدا بەئەرمەنی و ئاسوورییەکان، تا لە هەمان کاتدا دۆستایەتی ڕووسیا و گورجستانی بۆ دەسەبەر بکەن. دەڵێن کارەساتی بەسەردادان و غافڵگیر کردن و قەڵاچۆ کردنی نزیکەی دە هەزار ئاسووری ساڵی ١٨٤٣، کە بەکۆڵەکەی هەرە گرنگی سەربەخۆیی کوردستان دادەنران، دوور نەبووە لە ڕکەبەرێ و ململانێی نێوان ئەو موبەشیرانەی کە لەو سەردەمەدا پەیتا پەیتا هاتوچۆی ناوچەکەیان دەکرد(١).

دوا بەدوای ئەوەی لەشکری برایم پاشای میسری ساڵی ١٨٣٩ لە نزیب لەشکری عوسمانی شکاند و تارومار کرد، سوڵتان عەبدولمەجید هاتە سەر تەخت و مژدەی داهاتنی سەردەمی ڕێکخستن (تەنزیمات)ی دا بەخەڵکەکە. هەر لەم بار و بوارەدا سیاسەتی شاڵاو بردنە سەر کوردی هەڵوەشانەوە و لەجیاتی ئەوە هەوڵیدا بەخۆشی و ئاشتی دڵی سەردارە کوردە کەوی نەکراوەکان بەلای خۆیدا بکێشێ. لە ساڵی (١٨٤٠)ەوە بەدواوە، چەند ناوبژیکەری تورکی کوردی زان سازدران و بۆ لای بەدرخان بەگ بەڕێ خران، تا لە نێوان ئەو دەرگای بڵندا ناوبژیکاری بکەن. ئەوان داوایان لە بەگ کرد بچێ بۆ ئەرزەرۆم، بەڵام ئەم گوێی خۆی لەم داوایە کەڕ کرد و هەر لەو ئاوازەی لێدا کە ئەو لە فرمانی سوڵتان هەرگیز دەرناچێ و لە گەورەیەتی ئەو لاری نییە - نەک هەر ئەمە، بەڵکو خەڵات و دیاریشی بۆ چەند پاشایەکی دەست و داوێن پیسی تورک نارد و ملی بۆ ئەوەش خەواند کە ڕێ بەفەرمانبەرە تورکەکان بدرێ بێنە ناوچەکە و ژمارەیەکی

(1) C. Sandreczki: Reise nach Mousl und Kurdistan nach ulrmia...

دیاریکراو لە کوردان بۆ خزمەتی سەربازی ناونووس کەن. تاقیکردنەوەی ئەم کوردە چیانشینانە، کە بریتی بوون لە لاوی خوێن گەرمی هۆکارەی بەربەرەڵلایی دەشت و دەر و بەر و ماوەی ئازادی ناو چیاکان، تا بڵێی تاڵ و پڕ مەینەتی بوو. ئەوانەی کە ناچار کرابوون لە ناو سوپا پەتازەدەکەی تورکدا خزمەتی سەربازی بکەن، یان بەتووش بوون مردن، یان بەڕاکردن خۆیان دەرباز کرد. زۆرن ئەوانەی کە بەچاوی خۆیان بینویانە چۆن لاوی کوردی شان و مل ئەستووری تەندروست، دەستیان لە کەلەپچە قایم دەکرا یان زۆر جار بەگەلە چات دەکران و تابوور تابوور بەنووکە نێزەی سەربازە تورکەکان لە سەربازخانەکان توند دەکران. بەدرخان بەگ نەیدەتوانی چاو و گوێ لەو هەموو گازندە و سکالآیە داخا، کە سەرۆک هۆزە کوردەکان لە هەموو کوردستانەوە لە بەردەمییدا هەڵیان دەڕشاند. لەم قۆناغەی دووەمدا، ئەوەی زیاتر کوردی بۆ پاڵ بەدرخان بەگ پاڵ نا، ئەم مەسەلەی سەربازییە بوو. دوای ئەوە مەسەلەی باج و سەرانەی گران و لە وزە بەدەر. ئینجا پەکخستنی دەسەلآتی سەرۆک هۆزەکان کە لە باو و باپیرانەوە بۆیان مابووەوە و دانانی فەرمانبەری تورک لەجیاتی ئەوان بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکان. ئەم دەستدرێژی و دەست تێوەردانە بێ یەک و دوو کردنە هیچ گومانێکیان بۆ سەرکردەکانی کورد نەهێشتەوە کەوا دەرگای بلّند بڕیاری داوە و سوورە لەسەر نەهێشتنی ئاسەواری دەسەلآت و دەسڕۆییان و کەوا ئەم بەناوە (تەنزیمات)ە لە پەردەیەک بەولاوە بۆ هەوڵێکی یەکجار فراوان بۆ قەلاچۆکردن و ڕەگەز بڕکردنی کوردان هیچی تر نییە. تەنانەت ئەو هۆزانەی ناو چیای تۆرۆس کە دەکەونە لای باشووری ئەوانەوە و وا دادەنرا کە لە پاش کارەساتەکانی سالآنی (١٨٣٤ - ١٨٣٩)ەوە دەبێ ئیتر سەریان نەوی کردبێ. لە دانی سەرباز و سەرانە سەرپێچییان کرد. ئەو کەسەی شێروخەتی سەربازی دەیگرتەوە خۆی لە چیا و هەڵەتە سەرسەختەکان قایم دەکرد و ڕێگاوبانەکانی کاروان پڕ دەبوو لە ڕێگر و ڕووتکەرەوەی چەکدار. ئاگادارێک لەو سەردەمەدا نووسیویە: «ئەو

نائەمنی و پاشاگەردانییەی کە جاران لە چیای ئەراراتەوە تا دەگاتە بەغدا باسی لێ دەکرا، ئێستا پاش دەرچوونی خەتی شەریفی گولخانە واتە یاسای چاکسازییەکان، ئەوەندەی تر خراپتر بوون. چونکە پاشا عوسمانییەکان بە بەهانەی سەربازگیرییەوە کوردیان دەرەتانده چیاوچۆڵەکان و ناچاریان دەکردن دەست بدەنە جەردەیی».

کەنشتی گاوران لە ئەستەمووڵ و شارەکانی تری ناوچەکان، کە نەک تەنها بەناوی گاورەکانی خۆیانەوە دەدوان بەڵکو دەربڕی دەنگی وەرزێڕە کورد و یەزیدییە کەساسەکانیش بوون، لەسەر ئەو دەستدرێژی و ستەم و تالانکردنەی کە لە ڕەهەندە کورد و هەندێ سەرکردەی هەڵگەڕانەوەکە دەکرا، چەند جار سەریان لە دەرگای بلند دا و داکۆکییان بۆ کردن، کەچی دەرگای بلند بڕیاری شالاوێکی تری بەفەرماندەیی مارشاڵ عوسمان پاشادا کە لەسەر خواستی ڕووسیا بنکەی سوپاکەی لە ئەرزەڕۆمەوە گوێزرایەوە دیاربەکر. ساڵی ١٨٤٤ عوسمان پاشا سەرۆکە کوردەکانی بانگ کردە سەربازگەکەی لە دیاربەکر بۆ گفتوگۆ دەربارەی چۆنیەتی و ڕێگە و شوێنی دانی باج و سەرباز بەدەوڵەت. بەدرخان بەگ داواکەی سەرعەسکەری بەهەند وەرنەگرت و بەپێچەوانەوە، جوببە بەزێڕ نەخشاوەکەی کردە بەر و مێزەرە زلەکەی کە لە چەند پارچەی شاڵ و هەوریی لێک ئاڵراو پێکهاتبوو کردە سەر و شەڵوارە هەوریەکەی لە پێ هەڵکێشا و جووتێک کەوشی خۆڵاتی لووت هەڵگەڕاوەی سووری کردە پێ و چەند دەستەی لە هاوپەیمانە هەرە دڵسۆزەکانی کە بریتی بوون لە ڕۆڵەی بەجەرگی هۆزەکان، بە ڕمی دە پێ درێژ و تفەنگی کارخانەوە خستە تەک خۆی و دەستی کرد بەگەشتێکی شاهانەی بەسەرکردنەوەی دۆستان و تاوتوێ کردنی بارودۆخ. سەری لە هەموو سەرۆک هۆزەکانی ناوچەکە دا هەر لە جزیرەوە بگرە تا دەگاتە ڕۆخەکانی خوارووی گۆلی وان، لە هەموو شوێنێک لە لایەن خەڵکەوە، چ گاور چ کورد، وەکو میر پێشوازی و خۆشهاتنی لێ کرا، بەگ داوای لە هەمووان کرد کە کۆمەک بەخەزینەی جەنگ بکەن و بۆ مەسەلەی

سەربەخۆیی تا دوا تنۆکی خوێن بەدڵسۆزی بمێننەوە. گوایە لە هەندێ جێگا بۆ کۆکردنەوەی باروبوو لە هاولاتیان، هێزی بەکارهێناوە، بەڵام بۆ ساخکردنەوەی ئەمە پێویستە پرس بەو کەسانە بکرێ کە شایەدی حاڵ بوونە. شەڕخوازەکانی دەوڵەت لە ئەستەمبووڵ ئەمەیان کرد بەبیانوو و بۆ دەماندنی کوورەی جەنگ دژ بە بەدرخان بەگ و گوایە پێشگرتن لە تالان و بروکاری کە بەناڕەوا دەیانخستە پاڵ خۆی و یارانی. (پەترەکەکانی میللەتە خرستیانەکان)[1] پەیتا پەیتا لای دەرگای بلند ناڕەزاییبیان دەردەبڕی و نامە و ڕاسپاردەیان بۆ ئەنجومەنەکانی ناوچەکان و پیاوماقووڵی خرستیانەکان دەنارد «تا پشتگیری لەو لەشکرە ئیمپراتۆریەی دەوڵەت بکەن کە عوسمان پاشا فەرماندەیی دەکات و ئەم یاخیگەریەی کوردان دامرکێننەوە». بەڵام وەرزێڕە گاورەکان، لە ناوچەکە یان دەوروبەری، چ بەخوایشتی خۆیان بێ یان بەرژەوەندی وای سەپاندبێ، گوێڕایەڵییان بۆ ئەم بانگەوازانە هەرگیز نەکرد.

هەرکە دڵنیا بوو کە نە بانگەوازی خۆبەدەستەوەدان نە گفتوگۆ سوودێک دەبەخشن، عوسمان پاشا قۆشەنێکی گەورەی لە دیاربەکر لە باشوور و لە وان لە باکور مۆڵ دا. نەخشەکە وا بوو کە لەشکرەکەی وان هێرش بەرێتە سەر هەکاری و مۆک بەدرێژایی سەرچاوەکانی ڕووباری دیجلە تا یان پەرتە بەهێزەکانی نوروڵڵا بەگ و خان مەحموود بکا، یان بەرەو بلنداییەکانی بۆتان و بەرواری دەریان پەڕێنێ. لە خواریشەوە لەشکرەکەی دیاربەکر هێرش بەرێتە سەریان تا بەم جۆرە بەدرخان بەگ و دوو سەرۆکەکەی تر لە ناو چیاکاندا بکەونە ناو چنگاڵی ئابلۆوقەوە.

تۆماری ئەوتۆ دەربارەی شەڕ و پێکدادانەکانی ساڵانی ١٨٤٦ - ١٨٤٧، چ لەبەر نەبوونی سەرچاوەی خۆولاتی و چ لەبەر ئەوەی ئەوروپاییەکان ئەو کاتە پەیڕەوی سیاسەتی بێ شەرمانەی «پشتگیری

---

(١) لە نووسراوە ڕەسمییەکانی دەوڵەتی عوسمانییدا بەم جۆرە ناو دەبران (خرستیان میللتلرک پطریقلری) - وەرگێڕ -.

کردن لە تورکیای سەر ڕێگای چاکسازی»یان دەکرد و لەبەر ئەوە زۆر ئارەزوومەندی دامرکاندنەوەی ڕۆژهەلات بوون، بەدەستەوە نین.

بۆ ئەوەی بەر لە زیاتر ویرانکردنی ولاتەکەیان بگرن، دەمڕاستەکانی کورد و میرە ئەرمەنییەکانی وان لە بەهاری سالی ١٨٤٦دا بۆ ڕاویژکاری و تاوتویکردنی وەزعەکە کۆبوونەوە و ئامادەیی خۆیان بۆ ناوبژی کردن لە نیوان دەرگای بلند و خان مەحموددا دەربڕی و لە ژێر وشاری سەنگینی هەموو لایەکدا خان مەحموود بەلێنی دا خۆی بداتە دەستی ناوبژیکەرە کورد و ئەرمەنییەکانەوە، بەمەرجێک عوسمان پاشا پەیمانی ئەوە بدا کە خۆی و خاوخێزانی و دارایی و گەنجینەی سووکی دەستدرێژییان بۆ نەکرێ. پاش ئەوەی عوسمانییەکان سەد سوێند و ئایینیان خوارد و هەزار بەلێنی بێ چوون و چرایان لەم بارەیەوە دا، خان مەحموود لە چیاوە دابەزی و خۆی دایە دەستی ناوبژیکەرەکانەوە. ئەمانیش لەگەل خۆیاندا بردیان بۆ بارەگای فەرماندەی گشتی بەلام تورکەکان هەرکە خانیان هاتە بەردەست هەموو سوێند و پەیمانەکانیان قووت دایەوە و باری ڕەفتاریان گۆڕی و خانی هەلۆی ناو قەفەسیان دایە دەستی سەرباز، ئەمانیش نامەردانە بەستیان بەدارێکەوە و بەفەلاقەکردن و تف لێ کردن کەوتنە وێزەی ئینجا ڕێنگالی هەنگوینیان لە سەروچاوی هەلسوی تا مێش و مەگەزی تێ بەربێ. پاش ئەمە کە مەیدانی بۆ چۆل بوو، لەشکری عوسمانی وەکو دەعبایەکی هار بەولاتەکەدا پەرتەی کرد و کەوتە تالان و بڕۆ و ڕەشەکوژی ژن و مندال. ئەو هەموو قەلا و قەلایچانە کە هەریەکە بۆ خۆی ئاسەوارێکی مێژوویی خاوەن داستانێک بوو، ئەو هەموو شاکارەی میعمار و بیناسازە ئەرمەنییەکان کە لە سەردەمانی دێرین، یان چەرخەکانی ناوەڕاستدا دروست کرابوون وێران و هەموو لەگەل خاکدا یەکسان کران. ئیتر لەشکری عوسمانی کوللە ئاسا بەهەرجێیەکدا تێپەڕ بووایە جێ دەستی وێرانکەری بەجێ دەهێشت. تا ئەو دواییانەش خەلکی ئەو ناوچانە پەنجەیان بۆ شوێن گوللە تۆپی ئەوان درێژ دەکرد لەسەر هەندێ دیوار کە بەپێوە مابوون. یان ئەو هەموو وێرانەیەی کە

سەردەمانێک لانەی ئەرمەنییە ڕەشتوونی و مووکییەکان بوو، یان قەڵا و قەڵایچەی بەگلەرە کورد و ئەرمەنییەکانی سەرزەمینی مووک بوون کە بەدرێژایی چەند سەدە بەریان لە گێژەڵۆکەی هێرشی پەیتا پەیتای فارس و ڕۆم و عەرەب گرتبوو و ئێستا، نەک لەبەر ئازایی و کەڵەمێردیی تورکان - چونکە بەڕاستی درۆیەکی شەرماوەرە گەر بوترێ تورک لە هەر ڕوویەکەوە، لە کورد یان لە عەرەب یان ئەرمەنی یان ئاسووری ئازاترن - بەڵکو بەزەبری ئەو چەکە میکانیکییە کاریگەرانە کە شارستانییەتی چڵکاوخۆرانەی ڕۆژئاوا خستییە دەستیان و بەپەنای تەڵەکە و فێڵی سیاسەتمەدارە چڵکاوخۆرەکانەوە وا بێ دەسەڵاتانە کەوتوونەتە بەر ڕەشەبای جەور و ستەم. هەرکە خان مەحموود لە تەگەرەیی دەرچوو، تورکان پەیتا پەیتا لە دۆڵی بۆتاندا جێگیر بوون و مۆڵیان خوارد، دوای ئەوەی چەک و جبەخانەی تەواویان بۆ ساز درا و هەروەها بەتالیۆنێک سەربازی ئەرنەوتی شارەزای شەڕی چیایی بۆ پاڵپشتیان هێنرا.

زۆربەی زۆری لەشکری عوسمانیی بێ سەروبەرە و دیسپلین بوو، واتە هی شەڕی مەردانە نەبوون بەڵام بۆ تاڵان کردن و یەغماکاری و دزی و فزی وێنەیان نەبوو. لە لایەکی ترەوە، سوارەکانی بەدرخان بەگ بست بەبست شارەزای وڵاتەکەی خۆیان بوون و گرد بەگرد شیو بەشیویان دەناسی و چەندین جار لەناکاودا دەیاندا بەسەر هێزەکانی تورکدا و بەسەدەهایان لێ لەناو دەبردن بەڵام فەلەک لەگەڵ بەدرخان بەگی نەبەزدا نەیار بوو چونکە لە کاتێکدا ئەوەندەی نەمابوو لەگەڵ سەرکەوتنی تەواودا دەستکەنە ملی یەکتر برازایەکی کە فەرماندەی لایەکی لەشکرەکەی بوو پشتی تێ کرد و خیانەتی لێ کرد و دەستی خستە ناو دەستی دوژمنەوە. پاش ئەمە عوسمان پاشا دیسانەوە ڕاسپاردەی بۆ لای میر ناردەوە و داوای خۆ بەدەستەوەدانی لێ کرد. میر کە زانی هەموو دەروویەکی لێ گیراوە، ناچار لە مانگی ئابی ساڵی ١٨٤٧ زایینیدا خۆی دایە دەستەوە و عوسمان پاشا ڕێزێکی زۆری لێ نا، تەنانەت شیرەکەشی لەبەر نەکردەوە؛ جگە لەمە،

خۆشرەفتارییەکی تەواوی لەگەڵ خێزانەکەیدا کرا بەڵام «گەنجینەی شەڕەکەی» ، گوایە بۆ پاراستنی، لێ وەرگیرا. کۆشکەکەی و هەموو ناوچەکەشی چۆڵ کران و هەندێ لەو سەرەک هۆزانەی کە بەخوایشتی خۆیان دەگەڵی کەتبوون، ئازارێکی یەکجار زۆر دران. زۆربەی پیاوماقووڵ و سەرەک هۆزەکانی تر کەوتنە بەردەستی تورکان، یان ڕوویان کردە ئێران، یان پەراگەندەی قەفقاسیا یان لە دوو توێی چیاوچۆڵە سەختەکاندا خۆیان حەشار دا. وڵاتەکە پاش ئەو بارودۆخە سامناکە کەوتە ڕۆژەڕەشێکی ئەوتۆوە کە لە باسکردن نایەت. گەر دۆڵ و هەردەکان بکرێن بەچوار بەشەوە سێ بەشیان بوو بەوێرانەی تەواو و دانیشتوانی ڕەهەندەی شارەکان بوون. لەوێش ڕشانەوە لە بۆسەدا بوو بۆیان و لە ماوەیەکی کورتدا زۆربەیانی قەلاچۆ کرد(١).

عوسمان پاشا گەڕایەوە بتلیس، لەوێ ئاسیاوی ڕشانەوە کەوتە وێزەی لەشکرەکەی ئەویش و لە زستانی ١٨٤٧ - ١٨٤٨دا سێ بەشی لەناوبرد. بەدرخان بەگ خۆی و خاوخێزان و خزمانی لەگەڵ دوو لق سوارەدا لە خاربەرد و تەرابزۆنەوە ڕەوانەی ئەستەمبووڵ کران. لەوێوە خۆی ڕەهەندی ڤارنا کرا و هەندێ لەوانی تر نێرران بۆ کریت و ڤاندیا. ئەوەندەی پێ نەچوو شەڕی قرم (١٨٥٤ - ١٨٥٧) گوێی لە ئاسۆوە دەرکەوت و بەدرخان پاشا و کەسوکار و دەستوپێوەندەکانی لەبەر هەندێ هۆی سیاسی ئازاد کران.

---

(1) Xavier Hommaire de Hell: voyage en Turquie et en perse, execute par Lordre dugouvernement franc ais pendat les annees 1846 - 48 (1854) Vol. 11 p. 493.

## مێژوو خۆی دووپات دەکاتەوە

## (١٨٤٨ - ١٨٩٠)

دوورخستنەوەی سەرکردە ناودارەکان لە کوردستان، زۆربەی جارەکان لە کارێکی بێ هودە و کورت خایەن بەولاوە هیچی تر نەبوو و بەهیچ کلۆجێک نە بووە و نە دەبێ بەهۆ و مایەی هێمن کردنەوەی ئەو ناوچانەی کە لێیان دوورخراونەتەوە. بۆیە دوورخستنەوەکانی ئەمجارەش لەوانی پێشوو سوود بەخشتر نەبوون. ئەوە بوو لە ساڵەکانی ١٨٥٠ - ١٨٥١دا هەر ئەو هۆزانە و لە ناو هەمان چیا و هەردەدا لە دەوڵەت هەڵگەڕانەوە، پاش ئەوەی تورکەکان دەستیان خستبووە ژێر سەر کە گوایە جارێکی تر و هەتا هەتایە کەس زاتی ئەوە ناکا سەر بەرز کاتەوە! بەڕاستی خۆ دووپاتکردنەوەی مێژوو، بەهەمان بێن و تینەوە لەوێدا خۆی بەباشترین و دیارترین شێوە نواند. بەهەرحاڵ، دەرگای بڵند قەومانی شەڕی (١٨٥٠ - ١٨٥٤)ی لەگەڵ رووسیادا چاوەڕوان دەکرد، بۆیە هات سیاسەتی ئاشتبوونەوەی لەگەڵ کورددا گرتە بەر، ئەوە بوو گەلێک لەو سەرۆک هۆزە لاوانەی کە چەند ساڵێک بەر لەوە یان ڕەهەندەی ولاتان کرابوون یان لە کونجی زیندانەکان توند کرابوون هێنرانەوە و نێررانەوە مەڵبەندە چیاییەکانی خۆیان تا گەلەی سەرباز بۆ ئاسیاوی جەنگی سوڵتان جەلە بکەن، لەگەڵ ئەمەشدا داوای گۆڕینی باج و پیتاک کۆکردنەوەی عوسمانی لە کوردان هەر نەبڕایەوە، ئەمەش بەردەوام مایەی شەڕەچەق و ململانێی نێوان دەوڵەت و هۆزەکان بوو... گەر بێتو بینووسینەوە چەندین لاپەڕە بەژمارەی ئەو مەفرەزە جەندرمانە پڕ دەکرێتەوە کە بۆ مەڕانە و خەرمانانە و شتی تر دەکرانە سەر خەڵکەکە و لەو سەرەوە بەدەستی بەتاڵ یان بەشتێکی ناچیزەوە دەگەڕانەوە. لەو ماوەیەدا ڕووداوەکانی (١٨٣٤ - ١٨٤٧) سەرلەنوێ هەڵیان دایەوە ئەگەرچی بەشێوەی تر و لە ناوچەی دوور دەستتردا. لە ئاکامی شەڕی ساڵەکانی ١٨٥٤ - ١٨٥٥ی قرمدا

ژمارەیەکی زۆری هۆزی چەرکەز و موسڵمانی تر لە قەفقاسیاوە ڕووی کردە سەرزەمینی عوسمانلی و لەبەر ئەوەی سەرپشک کرابوون کە باشترین لەوەڕگە هەڵبژێرن، هاتن هەندێ شوێنەواریان هەڵبژارد کە پشتاوپشت هی کورد بوون و ئەمان بەشوێنی پیرۆزی باو و باپیرانیان دەژمارد. ئەمە کەڵکەڵەی نیشتەجێ کردنی هەم ئەمانە و هەم هۆزە کۆچەرە کوردەکانی خستە مێشکی دەوڵەتەوە؛ ئەوە بوو لەم ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆری کۆچەر لە هەندێ زەویوزاری میرییدا نیشتەجێ کران. نیشتەجێ کردنی هۆزە ڕەوەندەکان سوودێکی گەورەی دەبەخشی چ بەوەرزێڕە ئاسایش دۆستەکان و چ بەدانیشتوانی شارەکان. لەو بەڵگانەوە کە بەدەستمانەوەن دەردەکەوێ کە سەر قەشەی دیاربەکر لە حەفتاکاندا خۆی چاوەدێری کوردە تازە نیشتەجێکراوەکانی دەکرد و بەتەنگیانەوە بوو و فێری دروستکردنی گاوەسن و ئامێر و تفاقی تری کشتوکاڵی دەکردن. هەروەها زەوییەکانی بۆیان تۆو دەکرد و دەستی پاڕانەوە و نزای بۆ ئاسمان پەل دەکردەوە تا دەسکەوتیان باش بێ و ساڵیان بەهات. وەرزێڕ بەسروشت زوو هۆکارەی داب و ڕەسمی ڕەفتار و هەڵسوکەوت دەبێ و دەست دەکا بەبیرکردنەوە و فێربوون. ئەم کارە لە نێوان هۆزەکانی باکوردا لەسەرخۆ بەرەو پێش چوو و چەسپی و ئەوانەی بەزەوییەوە بەسترانەوە لێک نزیک بوونەوە و یەککەوتن. لەگەڵ ئەوەشدا سروشتی تالان و بڕۆکردن لە ناخی وەرزێڕ و ڕەنجبەرە کوردەکاندا، هەروەها لای دراوسێ ئاسوورییەکانیان، هەر مایەوە.

## ڕاپەڕینی کوردان لە ئێران

(١٨٨٠ - ١٨٨١)

شەڕی ساڵی ١٨٧٧ی عوسمانلی و ڕووسیا، وێرانکارییەکی گەورە و گرانی لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی عوسمانلییدا بەدوای خۆیدا هێشتەوە و چ شەڕەکە خۆی و چ ئەو ماڵوێرانی و بێوڵەتییەی لێوە دادەهات، کورد و دیانەکانی وەکو یەک گرتەوە. بەزینی عوسمانلی لە شەڕەکەدا دیسانەوە ژیلەمۆی ژێر خۆڵەمێشی ئارەزووی سەربەخۆیی لە دڵی کورداندا گەش کردەوە، بەڵام ئەمجارە، بەتایبەتی لە سەرەتایدا، دژ بەدەوڵەتی ئێران نەک عوسمانلی. سەرکردەی ڕاپەڕین ئەمجارە شێخێکی پایەبەرزی ناوچەی شەمدینانی سەر سنووری ئێران و عوسمانلی بوو. شێخ عوبەیدوڵلا کوڕی شێخ تەهاری خاوەن ڕێز و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی، سەرکردەی بزووتنەوەکە بوو. ئەمیش بەسەر هەمان ڕێگای بەدرخان بەگدا کەوتە دوای خولیای دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ. لە ساڵی (١٨٧٨) فەرمانداری ئورمیە، پەلاماری بردبووە سەر ناوچەکە و چەند کوردی سەر بەهۆزی شێخی گرتبوو لەسەری دابوون. چەند کچێشی فڕاندبوو (عەجەمەکان زۆر شەیدای کچۆڵە کوردەکان بوون کە بەجوانی و شۆخی ناوبانگیان دابووەوە). لە نامەیەکی نارەزاییدا کە شێخ بۆ کونسوڵێکی بەریتانیای ناردووە، وا نووسراوە گەلی کورد نەتەوەیەکی جیاوازە و ئایینیشی ئایینێکی جیایە (لەگەڵ هی خەڵکی تردا). یاسا و داب و نەریتیشی جۆرێکی ترە. کورد لە ناو هەموو میللەتاندا ناوی بەخراپ و زیانبەخش دەرکردووە. سەرگەورە و سەردارانی کوردستان، چ ئەوانەی لە وڵاتی عوسمانلییدا دەژین، یان ئەوانەی لە ئێراندا دەژین، هەروەها ئەو خەڵکانەی تر لە کوردستان نیشتەجێن (دیانەکان) هەموو لەسەر یەک ڕان و لەو باوەڕەدان کە بەم جۆرە لەگەڵ ئەم دوو دەوڵەتەدا هەتا سەر هەڵناکرێ و دەبێ، هەر چۆنێک بێ، شتێک بکرێ بۆ ئەوەی

حکوومەتەکانی ئەوروپا پاش گەیشتن لە مەسەلەکە وەزع و بارودۆخی ئێمە بخەنە بەر لێکۆڵینەوە و پشکنین، ئێمە دەمانەوێ جڵەوی کاروباری خۆمان بەدەستی خۆمانەوە بێ ئەگینا هەموو کوردستان هەڵدەستێتە سەر پێ و جڵەوی کار دەگرێتە دەستی خۆی چونکە ئیتر دەرەتان و توانای دەربردن لەگەڵ ئەم کار و کردەوە خراپانە و ئەم زۆرداری و ستەمە گرانەدا نەماوە کە ئێمە بەدەستی دوو حکوومەتی نیاز خراپەوە دەیکێشین... هتد». (١)

بۆ هێنانە دی هەڕەشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا کۆمەڵێک سەرداری ئازا و ڕەشید و بەناوبانگی ناوچەکەی بەدەوری خۆیدا کۆکردەوە و یەکێتییەکی بەناوی «بەرەی کوردانەوە» لێیان پێک هێنا. یەکێ لە ڕاوێژکارەکانی، بەحری بەگی کوڕی میر بەدرخان بەگی سەرکردەی بەناوبانگ بوو، لە پێش هەموو شتێکدا شێخ لەشکرێکی سوارەی بەسەرکردایەتی کوڕێکی خۆی بۆ داگیرکردنی ساوجبلاخ[٢] - کە دەکەوێتە باشووری گۆلی ورمێوە - بۆ ڕاستکردنەوەی هەندێ باری نالەبار کە خەڵکەکە داوایان لێ دەکرد - بەڕێ کرد. لە سەرەتای ساڵی (١٨٨١)یشدا، خۆی شاری ورمێی داگیر کرد و ئەگەر عوسمانی و ئێران، لە ژێر وشاری هاوبەشی ڕووسیا و ئینگلتەرەدا لەسەر زوو بەزوو زیندەبەچاڵکردنی بزووتنەوەکە ڕێک نەکەوتنایە، تەوریز

---

(١) کتێبی شین Blue Book (تورکیا ژمارە ٥، ١٨٨١) نامەکاری لە بارەی ڕاپەڕینی کوردی ئێرانەوە، ئەو ڕاپۆرتەی کە جێگری کونسوڵ، کلاتین لە ١١ی تەموزی ١٨٨١دا لە باشقەڵاوە (وان - هەکاری) ناردوویە/لاپەڕە (٧).

(٢) لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٦دا ساوجبلاخ وەکو مەڵبەندی بزووتنەوەی کورد لە ئازەربایجان درەوشایەوە. ئەم شارە یەکێکە لە شار بازاڕەکانی هۆزی بەهێزی موکری، کە مێژووی تا سەرەتای ئەم چەرخەی ئێستامان دیارە. المسعودی مێژوونووسی عەرەب بە«الماجروان» ناویان دەبا. بەڵام لە کلاسیکیانەکانی پێشووتری ئەرمەنیاندا بە"میرەکانی ماهکرتون کە لە خوارووی گۆمی ورمێ نیشتەجێن" باس کراون.

و هەموو ئازەربایجانیشی پێوە دەگرت شێخ خۆی و خاوخێزانی و سەرداره ناودارەکانی کە بریتی بوون لە سەرۆکی خێڵەکانی سەر بەو، هەموو گیران و ڕەهەندەی مەکە کران و شێخ لەوێ مرد و هەر لەوێش نێژرا. ساڵی (١٩٠٨) تورکە لاوەکان فەرمانی لێبووردنیان بۆ شێخ عەبدولقادری کوڕە گەورەی دەرکرد و کردیان بەئەندامی ئەنجومەنی پیران. لە شۆڕشەکەی ساڵی (١٩٢٥)دا ئەمیش گیرا و لە سێدارە درا، هەر لە ئاگربەسی (١٩١٨)وە[١] نەوەیەکی لاوتری ئەم خێزانە مەزنە، واتە شێخ سەید تەها ناوبانگی دەرکردووە و لە گەڵێ ڕووەوە بەیەکێک لە کەڵە سەرکردەکانی بزووتنەوەی سەربەخۆیی کوردستانی ئەم سەردەمە دادەنرێ.

---

(١) لە دەقە ئینگلیزییەکەدا، بەهەڵە (١٩١٩) نووسراوە - وەرگێڕ -.

## پەرەسەندنی بزووتنەوەی نیشتمانیی کورد

سەرنەکەوتنی ساڵی (١٨٨١)ی شێخ عوبەیدوڵڵا، زامێکی قووڵی لە هەستی شانازی و بەخۆوە نازینی سەرداره کوردەکاندا دادڕی و بوو بەپاڵنەرێکی بەتینی نوێی هۆشیاری نەتەوەیی لە مێشکی زۆربەی کورددا بەتایبەتی ئەوانەی ئاشنایەتییان لە بارەی شارستانییەت و جیهانی نوێوە هەبوو. گەلێ لاوی کورد لەو سەردەمەدا لە قوتابخانەکانی ئەستەمبووڵ سەرگەرمی خوێندن و زانیاریی بوون و هەندێکیان وەکو میره بەدرخانی و بابانییەکان گەیشتبوونە دانشگاکانی سویسرا و فەرەنسا. لە میسر ڕۆژنامەیەک بەزمانی کوردی و بەپیتی عەرەبی (بەناوی کوردستانەوە بەسەرنووسەری مەدحەت بەدرخان) دەردەچوو و حەفتەنامەیەک بەهەمان ناوەوە لە ژنێڤ بەفەرەنسی دەردەچوو.

لەبەر چەندین هۆ، هەستی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ لە هەستی نەتەوەیی گەلانی تر، لەسەرخۆتر و لە هەموو بار و بوارێکدا لەوان جیاواز پەرەی سەند. لە پێش هەموو هۆکارەکانەوە: زۆربەی زۆری هۆزە شەڕکەرەکان لە ڕاستیدا، گەلێ بەر لەوەی بیر لە سەربەخۆیی بکەنەوە یان پرۆگرامی بۆ دارێژن، خۆیان نیمچە سەربەخۆ بوون و هۆی ئەم لە پێوانەی گشتی بەدەریەی بزووتنەوەی کورد، بێ گومان، دارەڕا و سازمانی کۆمەڵایەتی هۆزەکان بوو. جگە لەمە نەبوونی دامودەزگای گشتی گەشکەرەوەی هەستی نەتەوایەتی هەروەها نەبوونی دامەزراوی دەربڕینی ئەم هەستە ئۆباڵی نەبوونی یەکیەتی و هاوکاری سیاسی ناو کوردانیان دەکەوێتە ئەستۆ. خۆپەسندییەکی یەکجار توند، ڕکەبەرێی تیژ چ لە نێوان تیرە و هۆزەکاندا و چ لە ناو خۆ بەخۆی سەرکردەی ئەو هۆزانەدا لەسەر دەست پێشەکی و ماف لەم شت و لەو شتدا، دوژمنی سەرخۆری ڕەگەزی کوردن، پووچترین ناکۆکی کە لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەر کۆمەڵێکدا باوە و دەکرێ لە دانیشتن یان ڕاز و گلەیی کردنێکی ڕووبەڕووی جگەرەخۆرێکدا

چارەسەر بکرێ، چەند جار بۆتە مایەی خوێن ڕشتنی هەزاران کەس و دوژمنایەتی چەند ساڵ و دەوران لە ناو کورداندا. کینەجۆیی و چیکلّدانە تەنگی کەسێک یان دووان، جارەها بۆتە مایەی خوێن ڕێژیی پشت لە دوای پشت و لە دەستچوونی توانا و تین و وزەیەکی زۆر و بەفیڕۆچوونی کات و دەرفەت و سەروماڵی هەزارەهای تێدا چووە و سامانی خۆ لە خۆدا کەمی ناوچەکەی داوە لە بەرد. هەر هۆزێک کە خۆی لەبەر هەر هۆیەک بەغەدر لێکراو دادەنێ تا تۆڵەی تەواو لە تاخم یان دەستەی نەیار نەکاتەوە کە زۆر جار لقێکن لە هەمان هۆزەکە خۆی، واز ناهێنێ و دەستبەردار نابێ...

شتێک کە بەچاوی خۆم بینیوومە و ڕووداوەکانی لە بەرچاوی خۆم بەیەکدا هاتوون، لەوانەیە باشترین بەڵگە بێ بۆ ئەم بەدبەختییە و دەرخەری ئەوەی چۆن ئازایەتی یان هەیبەت پارێزیی چەند کەسێک دەبنە مایەی ماڵوێرانی هەزارەها. شاری بتلیس وا بەبناری یەکێک لە زنجیرەکانی چیای تۆرۆسی ئەرمەنستانەوە. ئێرە ئەو سەرپردە سروشتییەیە کە چیاکانی دەوری دیاربەکر و دەشتی میزۆپۆتامیا پێک دەگەیەنێ. دوو تیرەی کورد لەم مەڵبەندە دەژیان: گابۆڵان و زەیدانیان. بنکەی سەرەکیی هەردوو تیرەکە لە شارەکەدا بوو بەڵام لق و پۆپیان هەتا قووڵایی چیاکان و تا دەگەیشتە دیاربەکر دەڕۆیشت. ساڵەهای ساڵ، بەوپەڕی دۆستایەتی و خۆش هاوسێیەتییەوە پێکەوە دەژیان. ژن و ژنخوازی، ڕاووشکار پێکەوە کردن، تەنانەت شان بەشانی یەک هێرشی هەرەوەزە تاڵان کردنیشیان دەکرد بۆ سەر مەڕوماڵات و وڵستی ئەرمەنییە بێ دەسەڵات وەرزێرە کوردەکان.

بەهاری ساڵی (١٩١٠) لەناکاودا وەکو شەیتان کەوتبێتە بەینیان، دوژمنایەتی کەوتە ناویان. گوایە لە ڕمبازییەکدا، ژنە دۆمێک بەسوارە گابۆڵییەکدا هەڵی داوە و توانج و تەشەری لە سوارێکی زەیدانی گرتووە. دوو سەعاتی ڕەبەق، تەقەی تفەنگ لە ئاقاری خوارووی شار نەبڕایەوە و چەند کەس کوژران و خەڵکێکی زۆرتر بریندار کران. وەکو هەموو جارانی

تر، پۆلیسی تورک خۆی تەریک گرت و هەر نارەمیشیش نەبوو، چونکە ئەو توانا و سام و هەیبەتەی نەبوو ناوبژی بکا یان ئاگرەکە بکوژێنێتەوە. ئەو ڕۆژە بەو جۆرە تێپەڕی. شەڕی ڕاستەقینە و گەرم سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی هەڵگیرسایەوە و تا هەشت مانگی ڕەبەق نەکوژایەوە. چەندین هۆز و تیرەی تر کە دۆستی ئەملا یان ئەولا بوون، هەر لە مۆتکانەوە بگرە تا دەگەیتە خارزان، تێوەگلان. بەم جۆرە شەڕەکە گەیشتە ناو چیاکانیش. لە چەند ساڵ لەوە بەرەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ سەرۆکی گابۆلاندا هەبوو، کە کابرایەکی ڕووخۆش و ڕوح سووکی چل پەنجا ساڵە بوو و لە شێنەییدا تا بڵێی لەسەرخۆ و نەرم و نیان. بەڵام لە شەڕەکەدا، دڕندە و خوێن بەرچاو گرتوو. ناسکی و زمان شیرینییەکەی جارانی هەر پێوە نەمابوو و دەتوت هەر خۆشی نییە. پەیتا پەیتا سوێندی دەخوارد و تا دوا دڵۆپەی خوێنی خۆی و هۆزەکەی دەست لە زەیدانەکان هەڵناگرێ تا ئەو قسانە نەخۆنەوە کە کردبوویان و لێیان پاشگەز نەبنەوە. لە ئەنجامدا شێخ محەمەدی خارزان (خارزان دەکەوێتە نێوان بتلیس و دیاربەکرەوە) کە سەردارێکی بەڕێز و لای هەمووان خۆشەویست بوو، کەوتە بەینیان و بوو بەناوبژیکەر و هەردوو لای ئاشت کردەوە. ساڵی ١٩١٢ پاش ئەوەی من شارەکەم بەجێ هێشت، شەڕ دیسانەوە هەڵیدایەوە... زۆر جار ئەم جۆرە شەڕە لەسەر دوژمنایەتی و کۆنە قین هەڵدەداتەوە، یان لەسەر ژن هەڵگرتن، یان تاڵانکردنی مەڕومالات و وڵست، یان لەسەر لەوەڕگە و پاوان. یان شتی هیچوپووچی تر. لەم سەردەمە هاوچاخانەی دواییدا، کوردان دەستیان نەگەیشتووە بەمەڵبەند یان دەسەڵاتی نەتەوەیی کە فێری شێوە و شێوازی فەرمانڕەوایی خۆبەخۆیی و نیشتمانییان بکات. ساویلکەیی و ساکارییان خراپ بەکار هێنراوە و تورکیا ئازایەتی و مەردایەتییانی دەرخواردی شەڕی بێ هودەی هەر ڕۆژە لەگەڵ یەکێکدا داوە. هەر وەکو هەموو دراوسێ ڕەسەن و خۆولاتییەکانی تری ناوچەکە واتە عەرەبەکان، ئەرمەنییەکان، ئاسوورییەکان و فارسەکان، کوردیش تا ئەم ساڵانەی دوایی دەرگایان

بەتەواوی لە ڕووی ڕۆشنبیری و کولتووری بێگانەدا خڕ داخستبوو، بگرە کورد لەم ڕووەوە گەلێ لەو گەلانەی تر لاملتر بوونە و لە چوار هەزار ساڵی ڕابردوودا لە ڕووکاری ڕەگەزایەتی و دەزگای کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە بای ئەو ڕۆشنبیری و کولتوورەیان بەرنەکەوتووە. بەڵام لەو کاتەوە کە کەوتوونەتە ڕەنجدان بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی و خوێنیان کردووە بە بەهای سەربەستی، کە هەوڵدانی میر بەدرخان و شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ سەربەخۆیی کوردستان نموونەی هەرە دیارین، گزنگی داهاتنی سەردەمێکی نوێ لە ئاسۆوە تان و پۆی دەرکەوتووە. گومان لەوەدا نییە کە چالاکییە شۆڕشگێڕانەکانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردووی ئەرمەنییەکان بۆتە پاڵ پێوەنەرێکی بەهێز و نموونەیەکی بەرز بۆ سەرکردە کوردەکان. گەورە پیاوانی خێڵە گران و بەهێزەکانی حەیدەران، تاگوڕی و شکاک کە لە باکور و باکوری ڕۆژهەڵاتی گۆلی واندا نیشتەجێن، دەستێکی باڵایان لە کڕین و تێپەڕکردنی چەکدا بۆ ئەرمەنییەکان لە ئێران و ڕووسیاوە هەبوو و گۆرانیبێژە کوردەکان ئازایەتی و نەبەردی سەرکردە ئەرمەنییەکانیان کردووە بەلاوک و حەیرانی بەسۆز. بەسروشت هەموو کوردێک ئازایەتی و کەڵەمێردی هەر جەنگاوەرێک تا قووڵایی دڵ کاری تێ ئەکا و ئەیورووژێنێ، ڕێبازی سەرەکی هەرە باوی ئەو ڕۆژنامە کوردییانەی کە لە میسر و سویسرا دەردەچوون، دووپاتکردنەوەی ئەوە بوو کەوا کورد، ئەرمەنییەکان، ئاسووری و یەزیدییەکان، دەبێ پێکەوە شان بەشانی یەک بۆ مەسەلە هاوبەشەکەی هەموویان کار بکەن. چەندین کۆمەڵ و تاکە کەسی ئەم ڕەگەزانە پێکەوە گفتوگۆ و دانیشتنیان لەسەر مەسەلەی هاوبەش کردووە. ئەگەرچی لە بوارێکی تردا، گەلێ سەرکردەی ئەم هۆز و ئەو هۆز کە بەپەیوەندی توند و گوێ لە مستی لەگەڵ تورکاندا ناسرا بوون، دەستیان لە ڕەشەکوژی و تالانکردنی خەڵکی ناوچەکە، بێ بواردنی کەس، نەدەپاراست.

## دامەزراندنی هێزی سوارەی کوردان

## (١٨٨٩ - ١٨٩١)

دەوڵەتی عوسمانلی بەتەواوی لەم جموجووڵ و هاریکارییەی نێوان ڕەگەزە نارەزاکانی دەم سنوورەکانی ڕۆژهەلاتی خۆی ئاگادار بوو. بزووتنەوەی لێک جیای شۆڕشگێڕانە، واتە هی کورد و هی ئەرمەنی، ئەگەرچی بەڕواڵەت و یەک بەیەک دژ و نەیار بوون، بەلام لە زەمینە و بارودۆخێکی تایبەتدا دەشا دەست باوێنە دەستی یەکەوە و بەڕاستی ببنە مایەی لێک هەڵوەشانی دەوڵەتی عوسمانلی. بۆیە دەوڵەت هەر لە هزر و بیری ئەوەدا بوو، هەرچۆنێک بێ، یان بەهەر شێوە و شێوازێک بێ، پوازی دووبەرەکی داکوتێتە بەینیانەوە و ئەم دوو گەلە دراوسێیە لێک بکا و تێکیان بەردا. بۆ ئەم مەبەستە بوو کە ساز و ئاوازی دامەزراندنی لەشکرێکی سوارەی سووک و خێرا لە ڕۆڵەکانی خێڵەکانی باکور هاتە کایەوە و وا دانرا ئەم لەشکرە ببێ بەپاشکۆ و پاڵپشتی لەشکری عوسمانلی. نەک هەر ئەوەندە، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، بۆ ڕێزنان و پایەدان بەو لەشکرە، ناوی خۆیشی لێنا و بەناوی (سوارەی حەمیدیە)وە ناوی دەرکرد. بەناوە حەفتا و شەش تیپ هەر تیپەی چوار سەد زەلامی یەکە یەکە بەخۆ و بەئەفسەرەوە لە ڕۆڵەکانی خێڵەکان سازدرا و خرایە ژێر فەرمانداندەیی سوپای چوارەمی دەوڵەتەوە کە بارەگاکەی ئەو کاتە لە ئەرزنجان بوو[١](ط).

ئەوەی ڕاستی بێ ئەم تیپانە هەرگیز هێز و دەرفەتی تەواویان نەدرایە.

---

(١) بنەما و پلانی ڕاستەقینەی ئەم نەخشەیە لە لایەن مارشال ڤۆن دێرگۆلتزەوە دانرا کە خۆی ئەفسەرێکی ئەڵمان بوو و لە ساڵی (١٨٨٢)وە لە لەشکری عوسمانلییدا کاری دەکرد. بەلام وێ ناچێ ئەم مەسەلەیە هەر ئەمەندە بووبێ و بەس چونکە ناشێ ئەو دەوڵەتانەی کە لەو کاتەدا بۆ «کەلنەکردنی سنوورەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی» قوریان دەپێوا لەم سیاسەتەدا دەستیان نەبووبێ.

هەندێکیـان هەر داشنەمـەزران و هەر بەناوی بێ ناوکی مـانەوە ئەوە بوو نزیکەی بیست تیپیـان، کە چ لە لایەن کەرەستە و تفاقـەوە و چ لە بارەی بەرگەوە کە جلە کوردییە جوان و بەرچاویە تایبەتییەکەی خۆیان بوو، تەواو بوون، سـالّی (١٨٧٩) دژی یۆنان بەکـار هێنران و بۆ ئەم مـەبەسـتـە، لە مـەڵبـەندە چیـاییـیـەکـانی خـۆیانەوە بەرەو تەرابزۆن، بەڕێ خـران و لەوێوە بەپاپۆڕ، پاش ئەوەی لە ئەستەمبووڵ بە بەردەم سولّتان خۆیدا نمایشیان پێ کـرا، بۆ سـالۆنێـک نێـرران. لە شـەڕی (ثیـسـالی)دا خـرانە پێش لەشکری عـوسـمـانلییـەوە و شـەڕێکی تا بلّـێی مـەردانەیان کرد و لەو بیـست هەزار سـوارە، تەنـهـا دەوری پێـنج هەزار سـوارێکیـان لێ گـەڕایەوە، ئەوانی تر هەموو لە شەڕدا فەوتان. تێوەگلاندنی لاوی کورد لە بەند و باوی کاروباری سیاسی نەتەوەیی تورکدا لە دوولاوە زیانی بەخەڵکی وڵاتەکە بەخشی. لە لایەکەوە ئەمانی زیاتر بەرانبەر بەدراوسێکانیان، چ ئەرمەنییەکان چ کوردە وەرزێڕەکان، زبر ڕەفتارتر و دوژمنانەتر کرد. لە لایەکی ترەوە و لەمە گەلێ خـراپتـر و زیانبـەخـشـتـر، نەشـونماکـردنی هەسـتی نەتەوەیی کـوردایەتی بەشـێـوەیەکی تا بلّـێی قـووڵ دواخـسـت یان باشـتـرە بلّـێین مـاوەیەکی دوورودرێژ پەک خـست چونکە ئاشکرایە کـە ئەم پلانە بوو بەهۆی ئەوەی توانا و ئاوات و ئارەزووی پشـتـێکی تەواوی لاوی بەهێـز و توانا و تەندروست، بۆ کـاروبـاری ناهەمـوار دژ بەنەتەوە و وڵات بەکـار بهـێنرێ، نەک بۆ سـوود و بەرژەوەندی نەتەوە و وڵاتەکەی خـۆیان. بۆ ئەوەی وێنەکـە بەتەواوی ڕوون بێـتـەوە، دەبێ ئەوەمـان لە بیـر نەچێ کـەوا لەم سـوارانە تەنانەت یەک تیـپ چییـە لە هۆزە دێرینەکانی سـەرزەمینی گـۆتۆ و کاشی، دانیـشـتـوانی پشـتـاوپشت ڕەسـەنی سـەرزەمـینی کـوردان، واتە ئەو سـەرزەمـینەی دەکـەوێتـە نێـوان شاری مـوسـڵ و چیـای حـەمـرینەوە کـە کلکەکانی خوارووی بەسەر دەشتەکانی باکوری شاری بەغدادا دەڕوانێ، ساز ئەدرا. لەجیاتی ئەوە، سولّتان شوێن و ڕێی نەخشە کێشراوی بۆ ئەوە داڕشت کە ئەمـان لە ڕووی ڕۆشنبیـرییـەوە زیاتر پێش بخا یان چاترە بلّێم

چەواشـە بکا. ئەوە بوو ژمـارەیەکی زۆر لە لاوانی سـەرزەمـینی گـۆتۆ دەستبژێر کران و بۆ ئەستەمبووڵ بران تا لەوێ لە قوتابخانەی تایبەتییدا پێ بگەیەنرێن و فێر بکرێن. لەوێ فێرکردنیان بەزمانی زگماکی خۆیان لێ قەدەغە دەکرا، گوایە لەبەر ئەوەی ئەم زمانە زمانێکی کێوبانەیە و لەجیاتی ئەوە بەزمـانی تورکی فـێـر دەکـران. بێ گـومـان، فـێـرکـردنی لاوانی کـورد بەزمـانی تـورکی لەجـیـاتی زمـانی کـوردی سـەد جـار لە نەبوون باشـتـر بوو چونکە هەر نەبێ چاو و مێشک و گوێی ئەمانەی لە ڕووی ئەو سیاسەتە چەوتەدا دەکـردەوە کـە تـورکـان بەرامـبـەر بەگـەلەکـەیان پەیڕەوییـان دەکـرد. سەرەنجام ئەم تەگبیرەش دەردەکەی بەتەواوی چارە نەکرد. دەوڵەت ناچار ما ماوە بدا بەو لاوانەی کە خزمەتی سەربازییـان دەهاتە سەر، بچنە ناو تیپە سوارەکانی لەمەڕ خۆیانەوە تا بەم جۆرە لە خزمـەتی سـەربازیی دەرباز بن. ئەمە هەر نەبێ کەلەبەرێکی بەڕواڵەت ڕووسپیکەر بوو بۆ ڕزگار بوون لەم تەنگنایە بەڵام مەسەلەی باجگیری وەکو قۆرتێکی زل، کە هەمیشە دەبووە مـایەی لێک کـەوتن و بەشـانی یەکـدا چوون، هەر مـایەوە. بۆ نموونە، ئەم ڕووداوەی خـوارەوە دێنمـەوە تا بزانرێ کـوردە مـل نەخـەوێنەکـان لەم ڕووەوە خـرابوونە چ بـارێکی سـەخـت و تـرسنـاکـەوە: سـاڵی (١٨٩٩)، بەڕێوەبەری ناوچەی بەرواری، باکـوری ڕووباری بوهتان، لە لایەن ژوور دەسـتەکـانییـەوە هەڕەشـەی لەسـەر کـار لادان و سزادانی لێ کـرا گـەر بەپەلە (١٥٠٠) لیرە مەڕانە کۆ نەکـاتەوە و ڕەوانەی نەکا. بۆ ئەم مەبەسـتە بیسـت سواری خرایە ژێر دەسـتـەوە لەگەڵ ئەفسـەرێکی ژەندرمـە و پێـنج زەبتـیـە (باجگیـر) و ئەم بیسـت سـوارە بۆ کۆکردنەوەی پارەکە یان دەسـت گـرتن بەسـەر مێگەلەکـاندا دەرکەوتن. هەرکە هەواڵ گەیشـتـە کـوردە مل نەدەرەکـان لە شـوێنێکی قـایم بۆیان دانیـشـتن تا هاتـنە بەردەمیـان و هەمـوویانیان، دوو زەبتـیـەیەیان لێ دەرچێ تاقبڕ کـرد. ئەو دوو زەبتـیـەیەش کـە دەرفـەتی ڕاکـردنیـان لێ بڕا بوو بەکـوردی لێـیـان پاڕابوونەوە ئینجا ڕزگـاریان بووبوو. یەک دوو مـانگێک دوای ڕووداوەکە، سـوڵتـان بەفـەرمـانێکی سـوڵتـانی نەک هەمـوو کـوردەکـانی بەخشی، بەڵکو بۆ هەریەکەیان خەڵات و بەراتیشی ڕەوانە کرد!.

# فەسڵی پێنجەم

## شۆڕشی (١٩٠٨)ی تورک و هەڵوێستی بەرامبەر بەکوردان

«پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا» هەرگیز هەندەی سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ - ١٩٠٩) نەخۆش و بێ تین نەبووە. ژمارەیەکی تا ڕادەیەک کەمی خەڵک لە پاشاگەردانی و شیرازە پچڕاوی ئەو سەردەمە سوودمەند بوون. یەکەمیان سوڵتان خۆی بوو، ئینجا چوار هەزار ژنەکەی ناو حەرەمسەرای سوڵتانیی، پاشا نزیکەکانی، دەستوپێوەندەکانی تا دەگەیشتە گزیر و هەواڵهێنەکان و هەندێ کاربەدەستی دووردەستی وڵات کە لە زەریای ئەدریاتیکەوە تا نۆکەندی فارسی[1] گرتبووەوە، جگە لە سوودخۆرە ئەوروپاییەکان، کە بەقەرزدان تا بن شان باسکیان چووبووە گەرووی خەزینەی ساردوسڕ و بەتاڵی دەوڵەتی عوسمانلییەوە. برسییەتیێکی ترسناک سەرانسەری وڵاتەکەی داگیر کردبوو و هەر ڕۆژە خۆزگەی دوێنێ و پێرێ دەخوازرا. ساڵ نەبوو شەڕ دژ بەعەرەب، ئەرنەوت، مەکەدۆنی، کورد و چەندین گەل و نەتەوەی تری ناو ئیمپراتۆریەت دانەگیرسێنرێ و خوێنی هەزارەهای تێدا نەڕژێنرێ. تورکە ڕووناکبیرەکان چ لە ناوەوە چ لە دەرەوەی وڵات بەرە بەرە دەکەوتنە پاڵ ئەو کۆمیتە شۆڕشگێڕانە کە نەتەوە و ڕەگەزە ناتورکەکان دروستیان دەکردن، تا هەموو پێکەوە حوکمی سوڵتان وەرگێڕن و سەرزەمینی عوسمانی لە وێران بوون و لێک هەڵوەشانی هەتا هەتایی ڕزگار کەن.

ساڵی ١٩٠٧ ئێدواردی حەوتەمی پادشای ئینگلتەرە سەردانی نیکۆلای تزاری ڕووسیای کرد و دەڵێن لەم سەردانەدا بڕیار درا دەوڵەتی عوسمانلی لە بەین ببرێ و وڵاتەکەی دابەش بکرێ و بۆ ئەم مەبەستە نەخشەی

---

(١) مەبەست نۆکەندی عەرەبییە - وەرگێڕ -.

کـاریگەر دارێژرا... ئەم هەواڵە بەپەلە بڵاو بووەوە و پیـاڵەی نارەزایی و مـەترسی لە پاشـەڕۆژی وڵاتی لێـوڕێژ کـرد و سـەرەنجـام بوو بەمـایەی ڕاپەڕینێکی سەربازیی لە مەکەدۆنیا (ساڵی ١٩٠٨) کە پارتی (تورکی لاو)ی هێنایە سـەر دەسـەڵات. دەسەڵاتدارە تازەکان بەئاسـانی توانییـان دۆست و لایەنگیرانی سوڵتان لە پایتەخت و شارە نزیکەکانی دەوروبەری بگرن و لە ناو بەرن، بەڵام لە چیاکانی زاگرۆس و تۆرۆس و بیـابانەکـانی عەرەبستاندا مەسەلەکە ئەوها بەئاسانی نەهاتە دەستەوە. ئەوە بوو هەر ئەو سـاڵەی کـە هاتنە سـەر حوکم، شاڵاویان برد بۆ ئەو خـێڵـە کـوردانەی کـە بەدۆستی سوڵتانی لادراو دادەنران[١].

هیچ یەکێک لەم هۆز یان ناوچانە بەئاسانی نەهاتنە دەسـتەوە، تا هێـزی گەورەیان نەکرایە سەر و لە ناویاندا جێگیر نەکرا، تەنانەت دوای ئەوەش نەریتی ملنەدەرانە و سەربەستیخوازانەی کوردان بوو بەئاگر و چووە کەوڵی ئەو هێزانەوە و ئارامی شەو و ڕۆژی لێ بڕین. لە پاڵ ئەمـەدا، لە مـانگی چوارەمی پاش شـۆڕشی تورکـدا، تەنگوچەڵەمـەی سـیـاسی دەرەوە، بەشێوەیەکی سەیر، یەک لە دوای یەک دەستیـان پێ کرد یەکەم بوڵغـاریا، سەربەخۆیی تەواوی خۆی لە دەوڵەتی عوسمـانلی ڕاگەیاند، لە ئاکامی ئەمەدا، ئەوستریا و هەنگاریا، سەنجاقی نوڤێ بازاڕیان بەخۆیانەوە لکاند. ئەم گیروگرفتە ئاڵۆزە نێودەوڵەتییانە جەزرەبەیەکی یەکجار توندیان گەیاندە سام و هەیبەتی شۆڕشی تورکان و یەکجار لەوە کوشندەتر بوون کە لە پایزی ساڵی (١٩١١)دا ئیتـاڵیا جەنگی دژ بەعوسمـانلی ڕاگەیاند و هەردوو بەشەکەی لیبیای لێ داگیر کرد. هەردوو لا شەڕکەرەکە خەریکی بەستنی پەیمانی شـەڕبەس بوون کە لە سـاڵی ١٩١٢دا و لەناکاودا گەلەکۆمەی چوار

---

(١) بەتایبەتی دژ بەملییە یەزیدییەکان (میهرانییەکان)، برایم پاشای وێرانشەهر (دیاربەکر) و بەرزانییەکان (کە لەم پانزدە ساڵەی دوایی و بەتایبەتی ئەم سەردەمەی نێستـامـاندا ناو و ناوبانگیـان دەنگی داوەتەوە) و لە پاشـان دژ بەهۆزە قـزلبـاشـە سەرسەختەکانی دەوروبەری دەرسیم.

دەوڵەتەی باڵکان هێرشی بردە سەر دەوڵەتی عوسمانی و هەتا بەر دەرگاکانی ئەستەمووڵ نیشتە سەر سوپای تورکەوە. لە هەمان کاتدا شەش هێزە هەرە گەورەکەی ئەوروپا «نەخشەیەکی چاکسازی»یان بەزۆر بەسەر دەوڵەتی عوسمانلییدا، لە ژێر سەرپەرشتی ئەوروپادا بۆ سوودی ئەرمەنستان، داسەپاند. تیشکدانەوەی ئەم ڕووداوانە، چ لە دوور و چ لە نزیک، لە پاڵ دەرکەوتنی ئەگەری لێک هەڵوەشان، بگرە لەناوچوونی هەتا هەتایی دەوڵەتی تورکدا، ڕابەرە ڕۆشنبیرە کوردەکانیان هەژاند و بۆ چالاکی و هەوڵی زیاتر پاڵیان پێوەنان ڕژێمی «تورکە لاوەکان» هەندێ چاکسازی دەستووری، وەکو ئازادی دوان، ئازادی چاپەمەنی و ڕۆشنبیری جاڕ دا. لە پایزی ساڵی ١٩٠٨دا یانەیەکی تایبەت بەکوردان لە ئەستەمووڵ بەدەستپێشکەری میر ئەمین[1] بەدرخانی کوڕەزای سەرکردە مەزنەکەی ساڵانی ١٨٤٢ - ١٨٤٧ بۆ لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی کاریگەرترین و پێویستترین شێوە و ڕێ و شوێن بۆ ڕێکخستنی گەل و نیشتمان دامەزرا. ئەم یانەیە ڕۆژنامەیەکی بەناوی (کورد تعاون ترقی غزتەسی)یەوە، واتە ڕۆژنامەی هاوکاری و پێشکەوتنی کوردانەوە دەرکرد. لەو چەند ژمارەیەدا کە لێی دەرچوون - هەرچەندە کەم بوون - سەرکردەی چون ئیسماعیل حەقی بابان، سەعیدی کوردی و شێخ قادر «داڕشتن و ڕێکخستنی زمانێکی ئەوتۆ باش»یان دووپات کردبووەوە کە ببێتە مایە و کلیلی کردنەوەی دەرگای فێربوون و شارستانییەت. هەروەها بەدووروودرێژی باسی گەنجینەی پڕ جەواهیراتی سامانی فۆلکلۆر و ئەدەبی کورد کرابوو و تۆژینەوە و تۆمارکردن و هەڵسەنگاندنیان بەڕێنومایەکی بێ چوون و چرا دانرا بوو بۆ یەکیەتی نیشتمانی و نەتەوەیی. لە پاڵ ئەمەدا، بەشێوەیەکی تەمومژاوی و ژێر لێوی، نەهـ لە فێربوون و بەکارهێنانی زمانی تورکی کرابوو و بە«بەفیرۆدانی کاتی منداڵانی کورد» دانرا بوو. چەند یانەی تریش چون ئەوەی ئەستەمبووڵ لە بەغدا و موسڵ و دیاربەکر بۆ بەدیهێنانی

---

(١) مەبەست میر ئەمین عالی بەدرخانە - وەرگێڕ -.

هەمان ئاوات و ئامانج و بەهەمان شێوە و شێواز پێکهێنرا. ئازادییە دەستوورییەکان دەرفەتی نوێیان هێنابووە کایەوە و لە دڵ و دەروونی لاوانی هەموو میللەتانی ناو ئیمپراتۆریەتدا گڕی ئارەزووی سەربەستی و فێربوونی زانست و یاسا و زمانی بێگانەیان هەڵگیرساندبوو. ئەم ئارەزوو تامەزرۆییە هاوبەشە بۆ فێربوون بوو بەپشتێنێکی توند و قوتابیانی پێکەوە نەک هەر لە قوتابخانە بەڵکو لە دەرەوە لە پێکگەیشتنە کۆمەڵایەتییەکانیشدا کە تیایاندا بەئازادی بیروڕایان ئاڵوگۆڕ دەکرد، شەتەک دەدا. ئاشتبوونەوە و دەست خستنە ناو دەستی یەکترەوە لە لایەن هەموو ڕەگەزەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانییەوە و هاوکاری هاوبەشیان لە ژێر ئالای عوسمانلییدا، بوون بەیەکێک لەو ئامانجە هەرە سەرەکییانەی کە شۆڕشی تورک بەردەوام باسی دەکردن.

لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەی زۆر بەدەستەوەن کەوا لە ناخی ناوەوەی «کۆمیتەی تورکە لاوەکاندا» بەتایبەتی ئەوانەیان کە دوو ڕەگ بوون بەچاوی گومان و ناڕەزاییەوە سەیری پێشکەوتن و پەرەسەندنی خێرای تێگەیشتن و هاوکاری نێوان دراوسێ کورد و ئەرمەنییەکان دەکرا. نوێنەرانی ئەم دوو گەلە لە پەرلەمان (مەجلیس)ی عوسمانلییدا چەند جار ناوبژیوانیی نێوان وەرزێرە کورد و ئەرمەنییەکانیان دەکرد و ئەو کێشانەیان چارەسەر دەکرد کە لەسەر زەویوزار یان شتی تر درابوون بەدادگاکان، بۆیە هەر لە سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٠٩وە کلک و بەکرێ گیراوی کۆمیتەی تورکە لاوەکان لە ناو ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا بەدزییەوە دەسووڕانەوە و خەریکی بڵاوکردنەوە و چاندنی تۆوی دووبەرەکی و لێک ترازاندن بوون لە نێوان کورد و ئەرمەنییەکاندا. ئەگەرچی وڵاتەکە لە ژێر باری گرانی و بشێوییە سیاسییەکانی ئەفەریقا و بالکاندا دەینرکاند و بەتەواوی یخی دابوو، بەڵام ناوچەکانی ئەرمەنی و کوردەکان کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فوراتەوە، بەخێرایی خەریکی بووژانەوە و هەستانەوە بوون پاش ئەو وێرانی و بێوڵەتییە ئابوورییەی کە سەردەمی عەبدولحەمید بۆی

هێشتبوونەوە و هەر لە نزیکەی پێنج ساڵدا (١٩٠٨ - ١٩١٣) هەموو ئاسیای عوسمانلی بەتایبەتی بەشە کورد - نەرمەنی - عەرەبەکەی بەتەواوەتی کەوتە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانییەوە. ئازادی سەودا و مامەڵە و هاتوچۆکردن، هێمنایەتی و مەترسی ڕەوینەوەی تا ڕادەیەکی ڕێگاوبانە گشتییەکان پاڵی بەخەڵکی ئەو سەرزەمینانەوە نا سەرلەنوێ بکەونەوە بوژاندنەوەی ئەو بەهرە میللییانەیان کە لە ماوەی چل و پێنج سەدەدا پشتاوپشت بۆیان مابووەوە(١). بەڵام ئەم مەدالیایە دیوێکی تریشی هەبوو. لە هاوینی ساڵی (١٩٠٨)ەوە ئازادی (حوریەت) بۆ هەموو هاوڵاتییەکی عوسمانلی جاڕ درابوو، وشەکانی، یەکسانی، برایەتی لەسەر زمانی هەر کەس بوون کە توانای دەنگ هەڵبڕین یان بەشداریکردنی خۆ پیشاندانەکانی سەرکەوتنی بکردایە کە هەمیشە هاتوهاوارێکی زۆریان بۆ بەرپا دەکرا. بەڵام ئازادی لە هەندێ بارودۆخدا، لەوانەیە ببێتە شیرێکی دوو دەم، چونکە کوردێکی کورد ئاسا کە فێری ژیانی کەشی دەستووری ڕێکوپێک نەبوو، بەتەواوی لە مرۆڤی دەکەوت. گەر وشەی ئازادی بەشێوەی تایبەتی خۆی و بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆی بەکار نەهێنایە. ئەو سەرۆک خێڵ و سەردار و تاخمانەی کە لە سەردەمی سوڵتانی لابراودا سوودمەند بوون، لە لایەن دەستە و تاخمە کۆنە پەرستەکانەوە هان دەدران لە ناوچە دووردەستەکاندا ئاژاوە و گێرەشێوێنی بەرپا بکەن و کۆسپ و تەگەرە بخەنە بەردەمی ئەو حیزبە شۆڕشگێڕەی کە لە ئەستەمبوڵ هاتبووە سەرکار. شان بەشانی بەزینە یەک لە دوای یەکەکانی تورکەکان لە باڵکان، تاڵان و بڕۆ لە دۆڵ و هەردە و دەرە دووردەستەکان و لە ناوچە سەخت و پەناکاندا پەرەی سەند و لەناکاودا ڕامالینی ڕانە مەڕ و وڵساتی وەرزێرە بێ دەسەڵات و پشت و پەناکان بوو بەشتێکی باوی ڕۆژانە. لە ناخدا ئەم کاسەیە بێ سەرکاسە نەبوو. مەسەلەکە لایەنێکی سیاسیشی

---

(١) بشاری چەتۆ ئاغا (١٩١٠) بۆی گێڕامەوە کەوا لە ماوەی دوو ساڵدا مێگەلە مەڕەکانی دوو بەرابەر بوون و وڵاخی بەرزەی سێ بەرابەر.

هەبوو. دروشمی «کوردستان بۆ کوردان» بەچرپە لە تەکیەی ئەم شێخەوە بۆ تەکیەی ئەو شێخ بڵاو دەبووەوە چونکە ئەم شێخانە لەو باوەڕەدا بوون کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی تووشی ئەوماڵوێرانییەی ساڵانی ١٩١٢ - ١٩١٣ نەدەهات گەر «تورکە لاوە» خوانەناس و فەرمەسۆنەکان نەبوونایە. سەرەنجام وەکو هەموو جارانی پێشتر کوردەکانی ئەرمینیا بەر لە هەمووان ئاڵای شۆڕشیان بڵند کردەوە.

لەبەر دەسکورتی یەکجار بەربادی دەوڵەت و پێویستی بەسەربازی تازە بۆ ئەو لەشکرانەی لە ڕۆژئاوا لە توانەوە و داهێزراندا بوون، مەئموورەکانی دەوڵەت لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات ناچار مان دەفتەرەکانی کۆنیان چ بۆ پارە و پیتاک چ بۆ سەربازی نوێ، دەرکەنەوە و بکەونەوە لێکۆڵینەوە تێیاندا. والیی بتلیس، ئەشێ بەنموونەی تورکێکی ئەستەمبووڵی ئەو سەردەمە دابنرێ کە لەگەڵ وشە تورکییەکانیدا هەندێ وشەی فەرەنسی شەل و پەل و بێ مانای تێکەڵاو دەکرد و بێ ئەوەی خۆشی بزانێ مانایان چییە یا چۆن دەردەبڕێن، دەکەوتە شڵەم و بڵەم. ئەم کابرایە ساڵی ١٩١٣ لە بتلیس بوو نازانم لە چ سەرچاوەیەکەوە پێی گەیشتبوو کەوا خانەوادەی شێخانی خیزان (أ) چەند ساڵی ڕەبەق نە یەک قورۆش باج و پیتاکیان داوە بەدەوڵەت و نە یەک سەرباز بۆ ئۆردو (لەشکر)ی تورک ئەگەرچی خانەوادەکەیان لە چەند سەد کەس پترە. والی لەگەڵ سڵاودا بۆ شێخ بەوپەڕی ڕێز و ئەدەبەوە داوای لێکرد ئەو پارە و پوولەی کە لەسەر خۆی و خانەوادەکەیەتی بینێرێ سەرەڕای چەند سەربازێک بۆ سوپا. شێخ بەهەمان ناسکی و لوتفەوە وەڵامی دایەوە کەوا ئەویش وەک باو و باپیرانی سەرۆکی ڕوحیی ناوچەیەکی زۆر گەورەیە و خاوەنی تەکیە و خانەقایەکە کە ساڵانە هەزارەها ڕێبوار چ دەست ڕۆ چ هەژار، لە دەروێش و بازرگان و دێوەرە و لانەواز و بێ داڵدە، تێیدا ئەحەوێنەوە و بێ هیچ کرێ و پاداشتێک تێیدا ئەخۆن و ئەخەون جگە لە دەیەها هەزار زیارەتکەر و نەزردار، لەبەر ئەمە خۆی بەپابەندی هیچ باج و پیتاکێک دانانێ و ئەو

پیاوانەش کە بەدەوریەوەن خەریکی بەجێهێنانی کار و فرمانی ئایینی و سەربازگیری نایانگرێتەوە. شێخ سەید عەلی هەر بەمەوە نەوەستا، بەڵکو ئەوەشی خستە سەر وەڵامەکەی کەوا لە سەردەمی پڕ فەڕ و بەرەکەتی سوڵتان عەبدولحەمیددا هەرگیز کەسێ ئەم جۆرە داوایانەی نەخستۆتە ڕووی. دیار بوو ئەم قسانە لای والی تازە پێگەیشتوو زەق و دەمارگیر بوون بۆیە خێرا هێزێکی گەورەی ژەندرمەی تەیار کرد و بۆ تاڵانکردنی مەڕوماڵاتی شێخ ناردنی. هەر لە دیاربەکرەوە تا دەگەیتە وان باوەڕ ناکرێ کوردێک یان موسڵمانێک هەبێ کە سەر بەشێخ یان پابەندی تەریقەت و ڕێنومایی ئەو نەبێ. نەک هەر ئەمە، بەڵکو خەڵکێکی زۆر وەکو پیاوچاکێک ڕێزی لێ ئەگرن و خۆشیان دەوێ. هەرکە هەواڵی ئەم کردەوەیەی والی پێ گەیشت، شێخ سەید عەلی نزیکەی حەوت سەد سواری لە چاکترین و ڕەشیدترینی شەڕکەران کۆ کردەوە و داوای پرچەک کردنیان بۆ داگیرکردنی شارەکە و وەدەرنانی ڕۆمییە خوانەناسەکان لێی کەوتە نوایان. ئەو هێزی ژاندرمەی کە لە وانەوە نێررا بوو لە نیوەی ڕێ بەلەشکرەکەی شێخ گەیشت و لەبەر ئەوەی زۆربەیان کورد بوون، بێ ئەوەی تەقە لە لوولەی تفەنگیانەوە بێ، بڵاوەیان لێ کرد. ساڵی ١٩١٣ شێخ شاری بتلیس و چوار دەورەی گرت و هەموو مەئموورە تورکەکان بەوالییە نیمچە ڕووناکبیرەکەشەوە تەنها ئەوەیان بۆ کرا بەپەلە پروزکێ بۆی دەرچن. شێخی خیزانیش هەر لەسەر ڕێبازی میر بەدرخان و شێخ عوبەیدوڵڵا و سەردارەکانی تر، بەیاننامەیەکی ماناداری بڵاو کردەوە و تێیدا هاواری لە ئەرمەنی و ئاسووری و کلدانییەکان کرد کە بۆ پشتیوانی کردن لەو ڕاپەڕین و وڵاتەکە لە (ڕۆمی) ڕزگار کەن، بەڵام ئەو زەمینە و کاتەی شێخ بۆ ڕاپەڕینەکەی هەڵی بژاردبوو تا بڵێی نالەبار و نارێک بوو. هەموو ئاسیای عوسمانلی لە ساڵی (١٩٠٨)وە کەوتبووە بارودۆخێکی ئابووری یەکجار خۆشەوە و خەڵکەکە بووژابوونەوە. ئەرمەنییەکان وتیان قازانجی هەموو لایەکمان لەوەدایە ئاشتی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەرمەنستان و

کوردستان بپارێزرێ و دەبێ پشتیوانی لە ڕژێمی «تورکە لاوەکان» بکرێ تا بتوانێ بەسەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەدا بازدا کە لە ناوەڕاستی وڵاتدا هاتوونەتە ڕێی. ڕاستە ئەم تورکە لاوانە ساڵی (١٩١٠) دەیەها هەزار ئەرمەنییان لە قیلیقیا لە ناو دابوو و ئەو ناوچە پڕ لە پیت و سامانەیان وێرانە کردبوو، بەڵام چ کوردەکان چ گاورەکان بەمانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی وەکو قەوارەیەکی یەکگرتووی سیاسی و ئابووری سوودمەند دەبوون. حوکمڕانی شێخ سەید عەلی لە بتلیس تەنها یەک هەفتەی خایاند چونکە تورکەکان لە دیاربەکر و مووشەوە لەشکریان کێشایە سەری و شارەکەیان پاش شەڕێکی سەخت گرتەوە و شێخ خۆی و هەندێ لە سەرگەورەکانی هۆزەکەی خۆیان کوتایە کۆنسولگەریی ڕووسەوە لە بتلیس، چەند هەفتە پاش ئەوە لە کاتێکدا شێخ هەوڵی دەربازبوونی بەرەو چیا سەختەکان دەدا دەسگیر کرا و خۆی و چوار کەس لە سەردارانی لەشکرەکەی لە مەیدانێکی گەورەی شاردا لە سێدارە دران.

## هۆزە کوردەکان و جەنگی یەکەمی جیهان

### (سەفەربەرلک) ١٩١٤ - ١٩١٨

هەر کەسێک بڵێ هۆزە کوردەکانی باکوری موسڵ و ڕووباری بۆتان و ئەرمەنستان تەنانەت تۆزقاڵێکیش لە ئەرمەنییەکان کەمتر لە جەنگی گەورەی جیهانیی یەکەمدا، تووشی دەردەسەری و کۆمەڵکوژی و ئازاردان بوونە، لە ڕاستییەوە گەلێک دوورە. زۆربەی کوردە ساکار و سادەبیرەکان هێشتا لە کاروباری ژیان و سیاسەتدا هەر باوەڕیان بەچارەنووس و قەزا و قەدەر هەیە بۆیە باسکردنی هەر زەرەر و زیانێک کە لێیان دەکەوێ، یان گازندەکردن لێی لایان نەنگە و بەوەی دەزانن گوایە لە کەسایەتی خۆیان یان لە پلە و پایەی هۆزەکەیان دادەشکێنی و لێی کەم دەکاتەوە، ئەمانیش وەکو گەلانی دیکەی هاوسێیان لە خۆ تێگلاندنی تورکان لە شەڕەکانی ئەوروپادا زۆر ئاگادار نەبوون. ئەگەرچی، بەسروشت، هەمیشە بۆ شەڕ و لێقەومان لەسەر پێن و بۆ تالان و بڕۆی پاش شەڕ تەنانەت لە جگەرەخۆرێکدا ئامادە و تەیار ڕادەوەستن. هەندێ لە هۆزەکان، بەتایبەتی کۆنە سوارەکانی «حەمیدیە» کە بەدەم سنوورەکانەوە دەژیان، لەبەر ئەوەی بەبەشێک لە لەشکری تورک دادەنران، بەزۆر پەسترانە ناو شەڕەکەوە. هەروەها ئەو سەردارە کوردانەش کە لەوانی تر هوشیارتر بوون و دەماری نیشتمانپەروەری کوردیان تێدا بوو، هێشتا بەتەواوی بەگیانی یەککگرتن و تەبایی و یەکدڵیی خۆشە نەبووبوون و هێمان بەباشی و سەرکەوتوانە بەرەو ئامانجی گشت لا، واتە سیاسەتێکی نەتەوەییانەی کوردیی جیاواز و سەربەخۆ، پاراو نەبووبوون. کورد وەکو گەلێک، چ سوود و بەرژەوەندییەکیان لەم شەڕە ماڵوێرانکەرەدا نەبوو. لە لایەکی ترەوە، داگیرکردنی ناوچە ئەرمەنی نشینەکانی عوسمانلی لە لایەن سوپاکانی قەفقاسیای ڕووسیاوە ئاوایی و لەوەڕگاکانی کوردی کردە مەیدانی جەنگی نێوان چەند دەوڵەت، ئەمەش وێ دەچێ، هیچ ڕێگایەکی تری لەبەر کورددا

نەهێشتبێتەوە. تەنانەت هۆزە کوردە گەورەکانی ئێران، کە وڵاتێکی سەربەخۆیە و بەدرێژەی ماوەی شەڕەکە بێ لایەن مایەوە[1]، چ لە باکور چ لە باشوور، بەزۆر ڕاکێشرانە ناو ئاگری جەنگەکەوە. لەوانەیە هەندێ کەس پێی سەیر بێ گەر بڵێین، شکاکەکان، موکریەکان، هەرتووشییەکان و ئەو هۆزانەی تری سەر سنووری تورکیا و ئێران لە باکور، هەروەها لوڕەکان، سنجابییەکان، کەڵهوڕەکان و هۆزەکانی تری باشووریش کە خاوەن دەسەڵاتن بەسەر شەقام و کاروانەڕێ سەرەکییەکانی نێوان کرماشان و بەغدادا، لە ئاکام و ئەنجامی ڕەنجبار و ڕۆژگاری شووم و ڕەشی سەردەمی جەنگ هەندەی هۆزەکانی تری کوردی ناو دەوڵەتی عوسمانی زەرەرمەند بوون کە ڕاستەوخۆ بەشداری شەڕەکە بوون. ئەم دوو هەرێمەی ئازەربایجان و کوردستانی ئێران کە دەکەونە باکوور و ڕۆژئاوای ئێرانەوە، چەند جار لە نێوان ڕووسیا و عوسمانلی و لە پاشاندا لە بەریتانیاشدا دەستاودەستیان کرد و هەر جارە دووچاری وێرانکاری و ماڵوێرانی و لێقەومانێکی یەکجار زۆر و گران دەبوون. میرزادە سورەیا بەدرخان، کە نەوەیەکی ڕەسەن و بەنرخی سەرکردە مەزنەکەی ڕاپەڕینەکەی (١٨٤٢ - ١٨٤٧)ە ئەمەی لای خوارەوەی لە بارەی پێوەندی نێوان ئەرمەنییەکان و کوردەوە لە سەردەمی جەنگەکەدا نووسیوە:

«لەگەڵ هەڵگیرسانی ئاگری جەنگەکەدا، زۆربەی ئەو کوردانەی گەیبوونە تەمەنی سەربازیی، پەسترابوونە ناو سوپای عوسمانلییەوە و لەبەر نەبوونی هیچ هۆیەکی پەیوەندی لەگەڵ کەسوکار و ناوچەکانیاندا، لەو پلانانە بێ ئاگا بوون کە دەوڵەتی تورک بەرامبەر بەکوردستان دای دەڕشتن و جێبەجێی دەکردن. جگە لەمە، دەوڵەت لە ناو هێزە نیزامی و نانیزامییە کوردەکاندا پڕوپاگەندەی دژ بەئەرمەنی بەتایبەتی و گاوران بەگشتی بڵاو دەکردەوە.

---

(١) بێ لایەنی ئێران هەر بەناو بوو، ئەگینا زۆربەی لایەنە شەڕکەرەکان، چ ڕووس و چ ئینگلیز و چ ئەڵمان و چ عوسمانی لە سەرانسەری ئەو وڵاتەدا گاڵەیان دەکرد جاروبار بەیەکیشیاندا دەدا - وەرگێڕ -.

نەیاریی کورد بەرانبەر بەئەرمەنییەکان نەگەر ڕاست بێ ئەگەر دروستکراو، گشتی دەسکردی پروپاگەندەی بەردەوام و پەیتا پەیتای تورکەکان بووە تورکە لاوەکان بەگوێی کوردەیان دەدا کەوا سەیر کەن ئەرمەنییەکان پاڵیان داوەتە هاوپەیمانەکانەوە و تەنها یەک مانگ بەر لەوەی عوسمانلی بچێتە جەنگەکەوە، ئەرمەنییەکانی قەفقاسیا و عوسمانلی لەگەڵ ڕووسیادا پەیمانی نووسراویان بەستووە و بەگوێرەی ئەو پەیمانە ڕووسیا لە داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتنی ئەرمەنستانی عوسمانلی و کوردستاندا یاریدەیان دەدا و سەرەنجام ئەرمەنییەکان تۆڵەی سەختی هەموو ئەو کردارانە لە کورد دەستێننەوە کە بەرانبەریان کردوویانە... ئەم جۆرە پروپاگەندەیە تا ڕادەیەک لە دڵی کورددا جێی دەبووەوە و جەنگاوەرە کوردەکانی وادار دەکرد بچنە پاڵ تورکە موسوڵمانەکان. بەم جۆرە کورد دەبوونە داردەستی تورکەکان و پێخوری پلانەکانیان و لە هەمان کاتدا بەکلکی تەور دژ بەخۆیان و چ لە باری گیانییەوە و چ لە بواری ماڵ و دارایییدا تووشی زیانی کوشندە دەبوون و دەبوونە مایەی وێرانکردنی وڵات و سەرزەمینەکەی خۆیان و لە کۆتاییدا ئەم ڕۆژە ڕەشەیان هێنایە سەر خۆیان کە بواری لێ دەرچوونی نییە(١).

لەبەر نەبوونی ڕێکخستن و نزمیی ئاستی هۆشیاری و ژیریی، ژمارەیەکی زۆری کورد جڵەوی بیریان لە دەست دەرچوو و بوون بەداردەستی گەلە پیاوکوژە دڕندە بێ دڵەکەی سالانیک و ئەستەمبوڵ و لە کوشتن و تالان کردن و پەراگەندە و دەربەدەرکردنی نیوەی گەلی ئەرمەن واتە نیوەی ئەو بەشەی گەلی ئەرمەن کە لە سەرزەمینی عوسمانیدا دەژیان - ئەوانەی لێ دەرچن کە لە ئەستەمووڵ و ئیزمیر نیشتەجێ بوون - و دەستیان تا ئانیشک ڕۆکردە ناو خوێنیانەوە. ساڵی ١٩١٥ - ١٩١٦ بەر لە گەیشتنی لێشاوی سوپای قەفقاسیای ڕووسەکان، کە چەند تابووری

(1) Prince Svreya Badrkhan: The Cace of Kurdistan against Turkey. By authority of the Hoyboon the Supreme Council of the Kurdish Goverenment. Together with an Introduction By Herbert Adams Gibson. Princeston. N. J. (USA) 1924, pp. 33 - 34.

ئەرمەنیشی تێدا بوو، زۆربەی کوردی ناوچەکانی وان، بتلیس و ئەرزنجان لە سەرزەمینی خۆیان هەلاتن، ئەوانەیان لێ دەرچێ کە بەر لەوە هەمیشە دۆست و هاوکاری ئەرمەنییەکان بوون. چەند هۆز بەپیاو و ژن و منداڵ و مەڕومالات و هەبوو و نەبوویانەوە، چ بەخوایشتی خۆیان چ بەترساندن یان زۆرلێکردنی دەوڵەت لەو ویلایەتانە هەڵکەنران و کەوتنە پێش ئەو لەشکرە شکاوانەی تورکەوە کە لەبەر سوپای ڕووسدا لە پاشەکشێدا بوون. کورد، چ لە چلەی زستان، لە ناو بەفر و بەستەڵەکدا، چ لە قرچەی گەرمای هاویندا ناچار بوون بەدوای مێگەلە مەڕومالاتەکانیان و کەرەستە و تفاقی ماڵەکانیانەوە، بەرەو باشوور تا دەم موسڵ و دیاربەکر یان بەرەو ڕۆژئاوا تا خاربورد و قۆنیە، خێڵ بەرەو خواروو و خێڵ بەرەو ژوور بکەن. ئەوان کە پەروەردەی کوێستانە فێنکەکانی ئەرمەنستان بوون زوو تووشی نەخۆشی دەهاتن و بەسەدەها لە کەناری ڕێگەکان لەبەر گەرما و گڕەی کوشندەی عێراق، یان لە دەشتە قومساڵە مەلاریاویەکانی ئەنەدۆڵدا دەکەوتن و بەلادا دەهاتن».

ئەو کوردانەی کە لە ماوەی شەڕەکەدا فەوتان هەرگیز لە ژماردن نایەن. بەقسەی میرزادە بەدرخان تورکەکان نزیکەی (٧٠٠) هەزار کەسیان ڕاگوێز کردووە (١٩١٤ - ١٩١٨) و لەمانە تەنها نیوەیان بەساخی دەرچوون[١] بەلام ژمارەیەکی کەمی ئەوانەی گەڕانەوە مەڵبەندە کۆنەکانی خۆیان لە ناوچە ئەرمەنی نشینەکانی پێشوو بۆ ماوەیەکی درێژ مانەوە، چونکە کە هاتنەوە نە بەرگدروو نە پێلاوساز نە پیشەوەری جۆراوجۆری تری ئەرمەنی مابوو تا ئەم پێویستیانەیان بۆ دابین بکا و کەم کورد، هەر نەبێ تا ئەو دەمە، شارەزایی لەو پیشە و تفاقسازیانەدا هەبوو.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## داواکارییەکانی کوردان لە بەردەم کۆنفرانسی ئاشتی

## (١٩١٩ - ١٩٢٠)دا

ئەگەرچی کورد بەدرێژەی شەڕەکە، بێ جیاوازی و پەنگانەوە، بێ ئامانج و ئاوات و پلانێکی داڕێژراوی نەتەوەیی، بۆ تورکەکان شەڕیان کرد و بوون بەقوربانی، بەڵام پاش شەڕ هاتنەوە سەرخۆ و ژیرییان نواند و هەوڵ و تەقەڵای خۆیان بەدوو لادا خستە کار. لە لایەکەوە، ڕووەو کۆنفرانسی ئاشتی هاوپەیمانەکان لە پاریس و لە لایەکی ترەوە، پەیوەندی و قسە و باسیان لەگەڵ تورکە شکاوەکاندا نەبڕی و کەین و بەینیان هەر هێشتەوە. لە قاهیرە میرزادە سورەیا بەدرخان و ئاوەڵەکانی کۆمیتەیەکیان بۆ سەربەخۆیی کوردستان پێکهێنا و ژەنەڕاڵ شەریف پاشایان[1] کە کوردپەروەرێکی دەرسیمی بوو و تا ئەو کاتە باڵیۆزی عوسمانلی بوو لە سوید، بەنوێنەری خۆیان دانا، تا مەسەلەی کورد بخاتە بەردەمی کۆنفرانسی پاریس و لەبەر ئەوەی هەندێ لە داواکارییە سنوورییەکانی کورد لەگەڵ ئەوانەی ئەرمەنییەکاندا پێکیاندا دەدا، نوێنەرە سەرەکییەکانی هەردوو لا، بۆغۆس نەوبار پاشای نوێنەری ئەرمەنییەکان و شەریف پاشای نوێنەری کورد، ڕێککەوتننامەیەکیان پێکەوە ئیمزا کرد کە هەردوو لا پابەندی مەسەلەی هاوبەش بن بێ جیاوازی و لێک کردنەوە. ئەمە بوو بەمایەی سەرسوڕمانی هەموو دیپلومات و کارناس و ڕۆژنامەنووسی پلەی سێیەمی هەموو لایەنەکانی ئەورووپا، چونکە ئەوان لە نیوە سەدەی ڕابردوودا، هەر لەسەر دوژمنایەتی خوێنخۆرانەی ئەم دوو نەتەوە دراوسێیە و هەرگیز پێکەوە هەڵنەکردنیان ڕاپۆرت و گوزارشیان ڕەش کردبووەوە،

---

(١) شەریف پاشا دەرسیمی نەبوو، ئەو لە بنەماڵەی خەندانی ناسراوی سلێمانییە. ئەو کاتەش باڵیۆز نەبوو چونکە بەر لە شەڕی یەکەم دوورخرابووەوە. لە بارەی ژیانییەوە چەند سەرچاوە هەن، لەوانە «اعلام الکرد»ی میر بەسری و یاداشتەکانی ڕەفیق حیلمی و هی تر. - وەرگێڕ -

پەیماننامەی سیڤەر کە لە نێوان هاوپەیمانەکان و دەوڵەتی تورکدا لە نابی ساڵی ۱۹۲۰دا ئیمزا کراوە، دانانی قەوارەیەک بۆ کورد بەم شێوەیەی خوارەوە دەسنیشان کردووە:

بڕگەی (٦٢): کۆمیتەیەک کە بنکەکەی لە ئەستەمبووڵ دەبێت و لە سێ نوێنەر پێک دێت کە لە لایەن حکوومەتەکانی بەریتانیا، فەرەنسا و ئیتاڵیاوە دادەنرێت، لە ماوەی شەش مانگدا لە وەکارکەوتنی ئەم پەیماننامەیەوە نەخشەیەکی ئۆتۆنۆمی ناوخۆیی بۆ ئەو ناوچە کوردنشینانە دادەنێ کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی فورات و خوارووی سنووری باشووری ئەرمەنستانەوە کە لەمەودوا دەستنیشان دەکرێ و باکوری سنووری تورکیاوە لەگەڵ سوریا و میزۆپۆتامیادا. ئەم نەخشەیە دەبێ ڕێ و شوێنی تەواو بۆ پاراستنی ئاسووری و کلدنییەکان و کەمایەتییە ڕەگەزی و ئایینییەکانی تری ئەم ناوچانە دابین بکا.

بڕگەی (٦٣): حکوومەتی تورکیا، بەگوێرەی ئەم پەیماننامەیە، پەیمان دەدا کە بڕیارەکانی ئەو کۆمیتەیەی[1] کە لە بڕگەی (٦٢)دا باس کراوە لە ماوەی سێ مانگدا لە ڕۆژی ڕاگەیاندنیانەوە بەحکوومەتی ناوبراو جێبەجێ بکا.

بڕگەی (٦٤): بەمەرجێک ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا گەلانی کورد کە لە بڕگەی (٦٢)دا دەستنیشان کراون توانیان دەری خەن کەوا زۆربەیان ئارەزووی سەربەخۆییان لە تورکیا هەیە و ئەگەر ئەنجومەنی «کۆمەڵەی گەلان»[2] پاش ئەوە وای دانا کە ئەم گەلانە توانای سەربەخۆییان هەیە، تورکیا بەگوێرەی ئەم ڕێککەوتننامەیە پەیمان دەدا ئەم ڕاسپاردەیە جێبەجێ بکا و واز لە هەموو ماف و داخوازییەکی یاسایی خۆی لەم بارەیەوە بهێنێ.

---

(۱) لە ئەسڵەکەدا وتراوە «هەردوو کۆمیتەکە...» کە بەلای منەوە هەڵەی چاپە - وەرگێڕ -.

(۲) مەبەست «عصبە الامم The League of nations»ە. - وەرگێڕ -.

دیپلۆماته تەرخانەکانی تورکیا ئەم ڕێککەوتننامەیەیان ئیمزا کرد بەلاّم ئاگادارانی قوولاّییەکانی سیاسەت لە ولاّتەکانی هاوپەیماندا، دەیانزانی کەوا ئەم ڕێککەوتننامەیەی لە سیڤەر دانراو تێیدا دان بەسەربەخۆیی کوردستان و ئەرمەنستاندا نرا، لە نامەیەکی بێ بایەخی مردوو بەولاوە هیچی تر نییە، سا هەر چۆنێک بێ، هەر وەکو لە سەرەوە باسمان کرد، سەرکردە کوردەکان ئەوەندە هۆشیار و ژیر بوون کە بەئاسانی هەڵنەخەڵەتێن، بۆیە لە ژێرەوە داوێکی پەیوەندییان، لەگەڵ تورکیادا هەر هێشتەوە. هەر دوا بەدوای ئاگربەسی ساڵی ١٩١٨، زۆربەی ڕووناکبیرە کوردەکان کە نەوەی خێزان و بنەماڵەی ناسراوی کورد بوون لە ئەستەموول چالاکییان سەرلەنوێ خستەوە گەڕ و گەلێک لەوان تا ئێستا ماون و بۆ مەسەلەی سەربەخۆیی هەر لە هەوڵ و تەقەلا دان. لەو ڕووناکبیرانە میر کامەران بەدرخان، نوێنەرێکی ڕاستەقینە و ڕەسەنی ئەو بنەماڵەیەی کە ناوی هەڵگرتووە و ئێستا ڕۆژنامەی «هاوار» بەکوردی لە سوریا دەردەکا، جگە لە بلاّوکراوەی تر، هەرسێ کوڕەکەی جەمیل پاشای دیاربەکر، ئەکرەم بەگ، قەدری بەگ و عومەر بەگ؛ سەناتۆر سەید عەبدولقادر ئەو نیشتمانپەروەری تورکەکان ساڵی ١٩٢٥ لە سێدارەیان دا؛ مەمدوحی سەلیم بەگ؛ مستەفا پاشای سولەیمانی[١]، ئەمین عالی بەگ و چەندین کەڵەپیاوی تر لە خانەدان و ژەنەراڵ و ئەفسەرانی کورد، ئەم نیشتمانپەروەرە کوردانە، چەندین دامەزراوەی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەیان چ لە پایتەخت چ لە ناوچەکانی کوردستان دامەزراند و کە کەمال ئەتاتورک لە بەشی ئاسیای تورکیا هێزی هاتەوە بەر و دەسەلاّتی گرتە دەست، دوایی ساڵی ١٩٢٣ ئەستەمبوولی گرتەوە، ئەم سەرکردە نیشتیمانپەروەرە کوردانە ولاّتیان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە هەندەران تا لەوێ سەرلەنوێ دەست بکەنەوە بەخەبات و تێکۆشان هەر وەکو لە خوارەوە دەردەکەوێ لە سالاّنی (١٩٢٣ - ١٩٢٧)دا بەرچوویەک ڕووی دا: سەرەڕای هەموو

---

(١) مەبەست مستەفا پاشای یامولکییە. - وەرگێڕ -.

گفت و پەیمانەکانیان و سەرەڕای ئیمزاکردنی پەیمانی سیڤەر، هێزە هاوپەیمانەکان خیانەتیان لە کوردستان و ئەرمەنستان کرد و دەستی هەردوو لایان «بەئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی لۆزانی ساڵی ١٩٢٣ لەگەڵ تورکیادا» کردە زاخەوە.

ساڵی ١٩٢٥، دوا بەدوای ئیمزاکردنی پەیماننامەکەی لۆزان، کورد ڕاپەڕینێکی سەرتاسەرییان دژ بەتورکیا بەرپا کرد. شێخ سەعید بانگی بڵندی دەستپێکردنی شۆڕشی نیشتمانیی دا و هەموو ئەو کوردە نیشتیمانپەروەرانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن - ناکۆکییەکانی ناو خۆیان و هەموو شتێکی خۆییان وەلا نا، ئەمەش بۆ تورکەکان تا بڵێی غافڵگیرانە و مایەی سەرسوڕمان - بوو و هەموو چوونە ژێر ئاڵای خۆیبوونەوە (١٩٢٦ - ١٩٢٧)[1] کە تاقە ئەنجوومەنی یەک دەنگ و باڵای خواستی کورد بوو. تەنانەت خۆپەرستترین و لاملترینی سەرۆک خێڵە کوردەکانیش، پشتگیری پڕ بەدڵی خۆیان بۆ خۆیبوون دەربڕی و زۆریان هەموو دەسهات و توانای خۆیان خستە ناو دەستی حکوومەتی نیشتیمانییەوە: هەر کەسێ خۆی بەپەیوەندیدار دادەنێ با بزانێت کەوا ڕۆژهەڵاتی نەگۆڕ وا بروسکەئاسا بەرەو خۆناسینەوە و خۆچەسپاندن دەچێ! تەنی بەخۆڵ بووی پادشاکانی گۆتێ و گورد، هی گوبارۆ و سوڵتان سەلاحەدین و کەریم خانی زەند و میر بەدرخان و شەهیدانی تری ئەم ڕێبازە پیرۆزە کە هەموو خۆیان بۆ کرد بەقوربانی، با لە گۆڕەکانیاندا شاد و مەستان ببنەوە!

کورد بۆیان دەرکەوت کەوا لەم جیهانە پڕ لە ئاژاوە و هەرا و گێرمە و کێشەی نەتەوەیی و نیشتمانییەدا، سیستەمی خێڵایەتی ئیتر وادەی بەسەر چووە و ئەگەر دەرفەت و ماوە بدرێ بەشێوە و شێوازە کۆنەکان، زەرەر و زیانی هەموو گەل و نیشتیمان بێ جیاوازی و بواردن ڕادەماڵێ.

---

(١) خۆیبوون دەوروبەری کۆتایی ساڵی ١٩٢٧ دامەزرا - وەرگێڕ -.

شایانی وتنه کەوا بەر لە شەڕی یەکەمەوە لەبەر چەندین هۆ و هۆکارەی جیاواز کرمی ناکۆکی لە سیستەمی خێڵایەتی دابوو. هەر لە داهاتن و پێکهێنانی سوارەی حەمیدیەوە، ڕکەبەریّ و ئێرەیی کەوتبووە نێوان ئەو سەرۆک هۆزانەوە کە بۆ ئەم هێزانە ناونووس کرابوون و ئەوانەش کە نەکرا بوون. هەر هۆزە یان لقێکی لەناکاودا لە هاوپەیمانی دوێنیّ دادەبڕا و دەچووە پاڵ هۆزێکی تر کە خاوەنی ئاو و لەوەڕی باشتر و فراوانتر بوو. ئەم دابڕانانە چەندین هۆیان بەبەرەوە بوو: ئێرەیی و ڕکەبەرێی کەسایەتی، باوەڕ بەوەی سەربەخۆ بوون لەوانەیە دەرفەتی باشتر بۆ خۆ نووسین لە ڕیزی سوارەی حەمیدیەدا برەخسێنیّ. یان کوڕێکی لە خوڕابین لە پیرەباب هەڵدەگەڕایەوە و دەستە و تاقم و پشتگیری بەدەوری خۆیدا کۆ دەکردەوە، یان سەردارێکی پیر و پەککەوتە، کە لەبەر هەندیّ دەمڕاست و پیاوماقووڵی خێڵەکەی خۆی بۆ ڕانەدەگیرا، شانی بۆ شل دەکردن و دەسەڵاتی دەخستە دەستیان. لە هەندیّ ناوچەی تر، کار بەپێچەوانەی ئەمەوە دەڕۆیشت، پیاوماقووڵێکی هۆزێکی بچووک دەرفەتێکی باش و لەباری بۆ پەلاماردانی نەیاران یان دراوسێکانی بۆ دەهات، بەزۆر سەری پیّ دادەنەواندن و دەیخستنە ژێر سایە و دەسەڵاتی خۆیەوە بەم جۆرە هەم ناوی دەدایەوە و هەم دەبوو بەخاوەن جیّ و ڕێی تایبەتی خۆی و هەم دەستەودایەرەکەشی دەگەیاندە پلەی هۆزێکی مەزن و بەتوانا. ئێستا، هەر چۆنێک بیّ، وا ئەم دووبەرەکی و لاملی و سەرکەشییانە بەرەو کۆتایی دەچن، جەنگی گەورە و قوربانییە زۆرەکانی و ئاکام و ئەنجامە وێرانکەرەکانی ڕەگەزی کوردیان تا مۆخی ناو ئێسک تەزاندووە و ئەمە گۆڕانێکی شۆڕشگێڕانەی قووڵی لە ناو مێشکی هەموو کوردێکدا هێناوەتە دی. هەرچەند کۆسپە سیاسییەکان گەورە و سەخت بن، هیچ شتێک ناتوانیّ هەڵمەتی بەتینیان بەرەو ئاوات و ئامانجە نیشتیمانییە ڕەواکانیان بوەستێنیّ.

پڕ بەپێستی واقیعیەت، بەو شێوە و مانایەی لەم سەردەمەی ئێستاماندا

بەکار دێت، ئەتوانین بڵێین سەرکردە کوردەکان واقعین. ئەوان بە بەسەرهات و تاقیکردنەوەی خۆیان دەزانن کەوا سەربەستیی نیشتیمانی لە لایەن هێزێکی داگیرکەری سەربەخۆوە بەخۆشی نادرێ، بەڵکو دەبێ بەزۆری چەک و ڕێکخستنی زەبەردەستانە لێی بسێنرێ. بەڵگەش بۆ ئەوەی کە سەرکردە کوردەکان بەقووڵی لەم ڕاستییە گەیشتوون ئەو سێ ڕاپەڕینە چەکدارانەیان کە دژ بەتورکیا لە ساڵی (١٩٢٣)وە بەرپایان کردووە.

## فەسڵی شەشەم

## یەکەم ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕانەی کوردان

## (١٩٢٥)

نەتەوەی کورد چاکەیەکی زۆری بەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانلییەوە هەیە. ئەوان بۆ پاراستنی ئیمپراتۆریەت تەنانەت لە خوێنی خۆشیان دریغیان نەکردووە و بۆ دامەزراوە دەوڵەتییەکانیشی سیاسەتمەدار و فەرمانبەری پایە بەرزیان داوە. دووبەرەکی و ناکۆکی لە نێوان هەردوو نەتەوەی کورد و تورکدا زۆر لەسەرخۆ و درەنگ دروست بوو، بەڵام هەرکە هەردوو لا لەوە وریابوونەوە کە درزی نێوانیان خەریکە دەم دەکاتەوە زوو کەوتنە خۆ و هەر کەسە دژ بەوی تر کەوتە کار. ساڵی (١٩١٥ - ١٩١٦) لەگەڵ پێشکەوتنی لەشکرەکانی ڕووسدا بۆ ناوەوەی خاکی عوسمانلی، تورکە لاوەکان فەرمانێکیان بەسوڵتان ڕەشاد ئیمزا کرد کە بەگوێرەی گەلی کورد لەو شوێنانەی ئەرمەنستان و کوردستانەوە کە دەبنە بەرەی شەڕ ڕاگوێزرێت و لە ناو تورکەکانی ئەنەدۆڵی ڕۆژئاوادا، هەر (١٠) کوردە لە ناو (١٠٠) تورکدا، جێنشین بکرێن. هەردوو نەتەوەکە خاوەنی یەک ئایین بوون و جیاوازییان تەنها لە زماندا بوو؛ با کورد زمانی خۆیان لێ قەدەغە بکرێ و بەتورکی بدوێن تا ئەو پشتەی کە دوای ئەوان دێت، بەتەواوەتی بتورکێنرێ. بەر لەوەی بۆ «ئەم تواندنەوەی گشتی»یە هەنگاو بنێن، تورکەکان لە پێشدا چەند پیاوی ماقووڵ و ناوداریان گواستەوە. بەڵام ئەنجامی هەموو ئەم ڕەنجە تەنها بەبا چوون بوو و مایەی سەرسوڕمان بوو بۆ تورکەکان، چونکە بەزەقی بۆیان دەرکەوت کە کورد هێندەی ئەرمەنەکان ئەگونجێن و لەگەڵ ئەم دەوربەرە نوێیەدا بەهیچ جۆرێک نایەنە تێکەڵ بوون و تەبایی[1]. تۆمارەکانی بەڕێوەبەرایەتی ڕاگوێزانەوەی دەوڵەتی تورک لە

---

(١) تورکەکان لە نێوان ساڵانی ١٩١٥ - ١٥١٨دا هەر تەنها بەکوشتن و =

ئەستەمبووڵ دەریدەخا کەوا لە ساڵی (١٩١٥)دا نزیکەی (٧٠٠) هەزار کورد لە کوردستانەوە بەرەو ڕۆژئاوای ئەنەدۆڵ ڕاگوێزراون[٢].

ساڵی ١٩١٩ تورکیا لەوپەڕی لاوازی و بێ دەسەڵاتییدا بوو و لە پەلوپۆ کەوتبوو. تورکەکان ناچار مان بکەونە لاواندنی کورد و هەردوو لا لە (مەجلیس) و لە ڕۆژنامەکانیشدا دەریانبڕی کەوا تورکیا سەرزەمینی باو و باپیرانی هەردووکیانە، چ تورک، چ کورد، بێ هیچ جیاوازی و لاسەنگییەک و کەوا تەنها ئەم دوو گەلە مافی ئەوەیان هەیە بەناوی وڵاتەکەوە قسە بکەن. تورکەکان بەسەرکردەکانی کوردیان وت کەوا «تورکیا کەوتۆتە بەر مەترسی سەختی دابەشکردن لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە و کەوا داواکارییەکانی ئەرمەنی و یۆنانییەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای خاکی تورک و کورددا لە لایەن هاوپەیمانانەوە پشتگیری تەواوی لێ دەکرێ» و گفتیان دا و دەستیان دا بەسنگدا بۆیان کە هەر ئەم مەترسییە لاچێ ئەوا چارەسەرێکی پاک و خاوێن و دادپەروەرانە بۆ ئاواتە نەتەوەییەکانی گەلی کورد دادەنرێ تورکەکان ئەوەیان لە بەرچاو بوو کەوا شەریف پاشا مەسەلەکەی گەیاندبووە کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس و لەو پەیمانەدا کە لەوێ بەسترا بوو، بڕیار درا بوو کوردستان نیمچە سەربەخۆییەکی پێ بدرێ بەڵام تورکەکان هەر لە ساڵی ١٩٢٣ توانییان پەیمانێکی نوێی ئاشتی لە (لۆزان) بەسەر هاوپەیمانەکان و هاوکارەکانیاندا داسەپێنن یەکسەر هەڵوێستی خۆیان

---

=تالانکردنی گەلی ئەرمەنەوە نەوەستان، بەڵکو نزیکەی نیو ملیۆن لاوی ئەرمەنییان، چ کوڕ چ کچ. ناچار کرد واز لە نەتەوەی خۆیان بهێنن و «ببن بەتورک» بۆ ئەم مەبەستە دەیەها هەزار منداڵی هەتیوی ئەرمەنییان کۆکردەوە و بەزۆر «تورکاندیانن» ئێستا تورکەکان دەبێ لەسەر ئەم کردارە دڕندانەیان بخرێنە بەر لێپرسینەوە.

(2) CF prince sureya Badrkhan. the case of kurdistan against Turkey, op cit. p. 32.

بەرامبەر بەکورد گۆڕی و کەوتنە بڕ و بیانوو بۆ پاشگەزبوونەوە لە یەکە یەکەی ئەو گفت و پەیمان و دەست بەسنگ دادانەی لە ڕۆژە ڕەشەکانی سالآنی (١٩١٨ - ١٩٢٢)یاندا دابوویان. خاوەن کۆمپیاڵەی قەرز، جامبازەکانی بازاڕەکانی ئەورووپا، بەتایبەتی ئەوانەی وەکو هار بەدوای نەوتدا دەگەڕان و هەریەکەیان سەر بەولآت و دەستەیەک بوون هەموو پێکەوە لە کاردا بوون و هەر لەم کاتەشدا مەسەلەی سەرلەنوێ نەخشە کێشانی سنووری باکوری عێراق لەگەڵ تورکیادا (نەوتی موسڵ) هێنرایە کایەوە و خرایە بەردەم (ئەنجوومەنی گەلان) لە ژنێف.

لەم بارودۆخەدا، سەرکردە نیشتیمانپەروەرەکانی کوردستان، هەرگیز نەدەکرا دەسەپاچە و دوورەپەرێز بوەستن و بێ دەسەلآتانە سەیری ئەم شەڕە سەگە بکەن کە لەسەر خاوەنداریەتی سەرزەمینی کورد و ئاسووری دەکرا، ئەو سەرزەمینەی لە ماوەی چوار هەزار ساڵی ڕابردوودا پشتاوپشت لەوان بەولاوە هیچ گەلێکی تری لەسەر نەبووە بەمدیو و ئەودیوی سنوورەکانی سوریا و تورکیا، عێراق و تورکیا و ئێران و تورکیا تا قووڵاییەکی زۆر قووڵ هەر وڵاتی کوردە و ڕۆڵەکانی هیچ کەموکوڕی و درێغییەکیان بۆ پاراستن و داکۆکی کردن لە ماف و داواکاری میللی خۆیان نەکردووە و لە نواندنی ئەوپەڕی ڕەشیدی و ئازایەتی بۆ ئەم مەبەستە کورتیان نەهێناوە جگە لەمە، تەنها تورکیا کوردی بەدوژمن و سەرچاوەی مەترسی و خەتەر دادەنا و هەوڵی دەدا کە لە کوردایەتیان بخا و لە ناو میللەتی تورکدا بیانتوێنێتەوە.

کورد لە ئەنجامی ئەو خیانەت لێ کردن و فریودانە لە ڕقدا دەکوڵان و پاش ئەوەی هیچ هیوایەکیان بەتورکەکان نەما کە چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ مەسەلەکەیان بخەنە ڕوو و، دوای ئەوەی کردار و ڕەفتارە دڕندانەکانی تورکەکان ئێشی گەیاندە ئێسکیان، ناچار مان بیر لە بەرهەڵستکاری و خۆپاراستن بکەنەوە و بۆ ئەم مەبەستە شەڕێکی گەورەی شۆڕشگێڕانەیان بۆ سەربەخۆیی لە تورکیا بەرپا کرد شەڕێکی ئەوتۆ کە لێی

دەوەشـایەوە ببێ بەمـایەی دەردەسـەریی هەرە گـەورە بۆ تـورکـیـا کـە تازە سیستەمی کۆماریی هەڵبژاردبوو و هێشتا بەتەواوی نەکەوتبووە سەرپێ ئەوە بوو بەسەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران و دەستەیەک ئەفسەری بڵند پایە چەک و جبەخانە ساز درا و گەل بۆ ڕاپەڕینی سەرانسەری لە ڕۆژی ٢١ی ئاداری ساڵی (١٩٢٥)دا بۆ دەرپەڕاندنی تورکەکان لە کوردستان ئامادە کرا. بەڵام جاسوسیەتی بەتوانا و سەرکەوتووی تورکەکان توانی پێش لە ڕاپەڕینەکە بگرێ و نەهێڵێ بەرپا بێ، شێخ سەعید بۆ سەردانی فەرماندەیی گشتی سوپای تورک بانگ کرا و لەبەر ئەوەی شێخ لە ئامانجی ڕاستەقینەی تورکەکان ئاگادار بوو، نەچوو و لەجیاتی دەنگی لە چەند سەد پیاوی کەڵەمێرد و ڕەشیدی دەوروبەری کرد ڕاپەڕینەکە لە (٧)ی مارتدا بتەقێننەوە لەجیاتی (٢١). بەڵام کوردەکان نە دەزگای بێ سیمیان هەبوو نە تەلەفۆن تا هەموو ناوچەکان لەم گۆڕینە ئاگادار بکەنەوە بۆیە تورکەکان سوودیان لەم کەلەبەرە وەرگرت و سێ لەشکریان بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشەکە تەیار کرد، کوردەکان زۆر دلاوەرانە شەڕیان کرد، چونکە هەموو دەیانزانی ئەم شەڕەی دەیکەن شەڕی چارەنووسە زەرەر و زیانێکی سەختیان لە تورکەکان دا و بەرەو شارەکانی ئورفە، سیوەریک و دیاربەکری پایتەختی کوردستانی تورکیا هەڵمەتیان برد، تەنانەت بەشی خوارووی ئەم شارەشیان داگیر کرد. کاتێک کە تورکەکان هەستیان بەوە کرد کە دەرفەتیان لێ بڕاوە و بەردەمی لافاوەکەیان بۆ ناگیرێ، ناچار هێزێکی تازەیان بەشەمەندەفەر بەسووریادا هێنا کە لە ژێر دەستی فەرەنسییەکاندا بوو و لە پشت هێزەکانی کوردەوە قایمیان کرد. کوردەکان کە کەوتنە نێوان دوو ئاگرەوە ناچار مان بکشێنەوە و خۆیان لە شوێنێکی ستراتیژی و سەخت قایم کەن. شەڕ هەر لە باکوری ڕووباری دیجلەوە بەرەو ژوور تا دەگاتە چیای ئەرارات کە لوتکەکانی بۆ شەڕکەر قایمترین قەڵای سروشتین دەوامی کرد لەبەر ئەوەی هێزەکانی تورک چ لە ژمارەدا، چ لە چەک و جبەخانەدا لەمان باڵا دەستتر بوون، ئەمان لەو شوێنە سەختانەی چیای ئەراراتدا سەنگەریان داکوتا کە پشتیان وا بەهەردوو کۆماری

ئەرمەنستان و ئازەربایجانەوە و لە لێقەوماندا هەمیشە جێگەی سەخت و باوەشی گەرمن بۆ حەوانەوەیان. ساڵی ١٩٢٦ تورکەکان دەستێکی گەورەیان لەو شوێنە وەشاند کە کورد کردبوویان بەمەڵبەندی سەرەکیی هێزەکانیان بەدرێژایی ساڵی ١٩٢٧ - ١٩٢٨ شەڕ و پێکدادانی سەخت بەردەوام بوو و تێیاندا کوردەکان چەندین ئەفسەری گەورە و کۆمەڵێکی زۆری سەربازیان بەدیل گرت جگە لە چەک و جبەخانە و تفاقێکی زۆری جەنگ.

لە ساڵی ١٩٢٤ەوە و لە گێژەنێکی مەقۆمەقۆی سەر مەسەلەی موسڵدا، تورکەکان چەند «دادگای سەربەخۆیی»یان لە دیاربەکر و قۆنیە و هەندێ شاری تردا سازدا بۆ دادگایی کردنێکی سەرپێی هەموو ئەو کەسانەی سەریان بۆ بەناوە چاکسازییەکانی کەمال ئەتاتورک دانەدەنواند. ژمارەیەکی زۆر جەنگاوەری کورد کە لە ڕاپەڕینەکەدا گیرابوون و هەندێ باشبۆزغی تر کە گومانی ئەوەیان لێ دەکرا لە ئامادەکردنییدا دەستیان بووبێ، لە بەردەمی دادگاکەی دیاربەکردا دادگایی کران نزیکەی (٥٣) ڕۆشنبیر و سەرکردەی سوپای کورد حوکمی مەرگ دران و بەئاشکرا لەو شارەدا لە سێدارە دران[١].

لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٧دا دەستەیەک سەرکردەی کورد، کە هەریەکەیان خاوەنی بیروڕایەکی سیاسی تایبەتی یان پابەندی پەیوەندییەکی تایبەتی بوون لە دەرەوەی کوردستان یەکیان گرت و کەوتنە دانان و داڕشتنی پەیماننامەیەکی نیشتیمانی بۆ وەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانیان. لەم پەیماننامەیەدا بڕیار درا کۆمەڵەیەک بەناوی کۆمەڵەی «خۆیبوون»ەوە پێک بهێنرێ و بکرێ بەبەرزترین ئەنجومەنی نیشتیمانی بۆ کوردستان یان لە شێوەی حکومەتێکی کورددا ڕەفتار بکات و هەموو دەسەڵاتێکی نیشتیمانی و نێودەوڵەتی بدرێتێ و هیچ

(١) لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٨دا تورکەکان فڕۆکەیان دژ بەکورد لە ئەرارات بەکارهێنا و دوو فڕۆکەیان کەوتە خوارەوە.

کەسێک یان دەستەیەک بەهیچ جۆرێک توانای دەستبەردار بوونی بڕیار و دەسەڵاتەکانی نەبێت.

«بەم جۆرە (خۆیبوون) لە ٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧دا بانگی سەربەخۆیی کوردستانی بەو جۆرەی لە پەیمانی سیڤەردا دیاریکراوە دا و (کورد ئاوا)ی سەر ئاگری داغ (ئەرارات)ی بەپایتەختی کوردستان دانا و لە بڕیارێکدا هەستی دۆستانەی گەلی کوردی بەرانبەر ئێران، ئەرمەنستان، عێراق و سوریا دەربڕی و بڕیاری کوردانی لەسەر بەردەوامبوونی جەنگ دژ بەتورکەکان دا تا دوا پاداریان سەرزەمینی باو و باپیرانی کورد بەجێ دەهێڵێ و کورد دەگاتە ئاوات و ئامانجی دێرینەی خۆی»[١].

میر جەلادەت بەدرخان، میر کامەران بەدرخان، مەمدوحی سەلیم بەگ و شاهین بەگ بەئەندامی ئەنجومەنی ڕاپەڕاندن دانران. ئەم ئەنجومەنە پۆستی فەرماندەیی گشتی سوپای میللی کوردستانی دا بەژەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا کە ئەفسەرێکی پایە بەرزی ئەرکانی سوپای تورک بوو لە شەڕی جیهانیدا و لە هەمان کاتدا سەربازێکی دلێر و بەجەرگ و بگرە ئەفسانەیی پلەی یەکەم بوو. ئیحسان نوری پاشا سیستەمی تازەی کۆماری تورکیای باش دەناسی و لە هەست و نەستی ئاگادار بوو هەروەها شارەزای توانا و لاوازی و سەرچاوەی تین و شوێنی مەچەک بادانی بوو.

---

(١) سورەیا بەدرخان - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## دووەم جەنگی شۆڕشگێڕانەی کورد

## (١٩٣٠ - ١٩٣٢)

خۆیبوون و فەرماندەی گشتی سوپا بڕیاریان دابوو تا دوا تنۆکی خوێن لە تێکۆشان بۆ ڕزگار بوون لە چنگی تورکەکان نەسرەون و بۆ ئەم مەبەستە گشت کارسازی و کەرەستە و چەک و جبەخانەیەک کە پێویست بوو ئامادە کرا. خۆیبوون مارەنگازی سەرنەکەوتنی ڕاپەڕینەکەی پێشوو بوو، بۆیە ئەمجارە، بەوپەڕی وریایی و ئاگادارییەوە هەنگاوی دەنا. ئەوان سەرەتا هاتن توانای هەموو ئەو خێڵ و هۆزانەیان یەکخست کە جاران هەندێکیان خۆیان دوورەپەرێز دەگرت لە بزووتنەوە. هەروەها مەودای چالاکی خۆیان تا دووردەستترین ناوچەی وڵاتەکە گەیاند جگە لەمە هەستی دۆستانەی ئەو گەلە دراوسێیانەشیان بەلای خۆیانەوە کێشا - تەنانەت یارمەتیشیان لێوە مسۆگەر کردن کە ئەوانیش خاوەنی کێشە و مەسەلەی هەمان جۆر بوون. بەدرێژایی ساڵی ١٩٢٩ پێکدادان لێرە و لەوێی کوردستان نەبڕایەوە، بەڵام لە بەهاری ساڵی ١٩٣٠دا بڵێسەی ئاگری شۆڕش لە لوتکە بەرزەکانی چیای ئەراراتەوە بڵند بووەوە و بەرەو شیو و دۆڵەکانی وان پەرتەی کرد و هەموو ویلایەتی بتلیس و دیاربەکر و ناوچەی بۆتانی گرتەوە. بەدرێژەی چەند مانگی ڕەبەق دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی تورک شان بەشانی تۆپخانە و فڕۆکەکانیان دژ بە«چەتە» کوردەکان و دڕندەییبان گرماندیان و لرماندیان لە کاتێکدا هێزە گەورەکانی ئەورووپا کە خۆیان چەند ساڵێک لەوەبەر سەربەخۆیی کوردستانیان خستبووە ئەستۆ و بەهەر دە پەنجە ئیمزایان کردبوو و، هەر بەشان و باهووی کۆماری تورکیاندا هەڵدەدا و ڕاوە قسەیان دەکرد بۆ ستایش کردنی. هەر لە (١٩١٥)ەوە تورکە شارستانییەتپەروەرەکان کەوتنە بەکارهێنانی ڕەفتاری ئەهریمەنانە دژ بەئەرمەنییەکان و یۆنانییەکانیش بەڵام گرانایی گەورە هەر خرایە سەر کورد، ژن و منداڵی بێ تاوانی کورد خرانە بەر هێرشی سەربڕین و لە

ناوبردن و ئەوانەی مانەوە بەرەو ڕۆژئاوای ئەنەدۆڵ دەربەدەر کران، چەندین هۆز بەخاوخێزان و ئاژەڵ و ماڵاتەوە بەزۆر شوێنەوارە دڵگیر و سازگارەکانی خۆیان پێ چۆڵ کرا و ڕەهەندەی کەنارە مەلاریا زەدەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست کران، تورکەکان، کچ، ژن و منداڵی تازەهەڵچوویان بەهەزارەها وەکو ڕەوەی کۆیلە دایە پێش و بەرەو ڕۆژئاوا ڕفاندیانن. برسیەتی و نەخۆشی و ڕەزالەت و چەرمەسەریش وەکو گورگی هار کەوتنە ویزەی ئەم کاروانە بێ کۆتاییەی مرۆڤی بێ دەسەڵات. لاشەی مردوو، بەتاک و کۆمەڵ، بەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکاندا بڵاو بووبووەوە، بەکورتی تەنانەت نیوەشیان بەسەلامەتی نەگەیشتنە دوا قۆناغ ئا ئەمەیە ta'alim a la turca – ڕۆشنبیری شارستانییەت بەشێوازی تورک!. ئەو ڕۆژە ڕەشەی کە بەسەر کورد هات، بەتایبەتی ژن و منداڵ و لە لایەن خۆیبوونەوە بڵاو کراونەتەوە ئەوەندە مایەی دڵ هەڵقرچان و بێزهاتنەوەن کە لێرەدا جێگەی باسکردنی نابێتەوە. چۆڵکردن و وێرانکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات کە ساڵی ١٩١٥ بەلەناوبردنی گشتی و ڕاوەدوونانی ئەرمەنییەکان دەستی پێ کرد، ساڵانی ١٩٢٠ – ١٩٣٢ بە لەناوبردنی گشتی و ڕاونانی کورد هاتە کۆتایی. لە سییەکانی ئەم سەدەیەدا گەلێ هەواڵنێری سەر بەڕۆژنامە تورکییەکانی ئەستەمبووڵ کە لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕاپۆرتیان بۆ دەناردن، داد و بێدادی دووروودرێژیان لە بارەی وێرانکاری گشت لایەنە و بەبیابانکردنی ناوچەکانەوە بۆ ڕۆژنامەکانیان دەنووسی، لەگەڵ ئەمەشدا بەریتانیای مەزن، هاوپەیمانە دێرینەکەی تورکیا، هەر هاوار و داد و فیغانی بۆ ڕاگیرکردنی «سەربەخۆیی سیاسی و یەکپارچەیی سەرزەمینی تورک» کرد و بۆی پاڕایەوە.

## دەرسیم ئیتر نەما...

## جەنگی شۆڕشگێڕانەی سێیەم ۱۹۳۷ - ۱۹۳۸

دەوڵەتە ئەوروپاییەکان کە کزترین هەستی مەسئولیەتیان بەرانبەر بەرەفتارەکانی تورکیا نەمابوو و کەوتبوونە پێشبڕکێ لەیەککردن بۆ کڕنووش بردنی سیاسی لە بەردەم دەوڵەتەکەی کەمال ئەتاتورکدا، هەلێکی ئەموار و لەباریان هێنایە پێشی بۆ زیاتر چەسپاندنی خۆی و قایمکردنی «جێ پێی». هێشتا زنجیرە چیاکانی دەوروبەری دەرسیم واتە ئەو ناوچایەی کە دەکەوێتە سەر پێچە گەورەکەی ڕووباری فورات لە ئەرمەنستانی ڕۆژئاوا، هەر وەکو خۆیان مابوونەوە و هێمان چەکمەی سەربازی تورکیان تێ نەچووبوو. دەرسیم کە وەکو بووکێکی بەختەوەر و ئارامگرتووی ناو باوەشی زنجیرە چیا سەرکەشە لوتکە بەفرینەکانی مەرجان (۱۱۰۰ پێ لە دەریاوە بەرز) و مەنسوور و چەند چیای تر بوو، چوار دەوری بەباخ و کێڵگەی سەوز و شیو و دۆڵی بەدارستانی هەزار ساڵە و ڕەزی پڕ لە میوە گیرابوو. هەتا ساڵی ۱۹۰۸ تورکەکان ئەوەندە شارەزای نەبوون و شارەکە و دەوروبەری هەر بەکشتوکاڵ و ئاژەڵداری و ڕەزی ترێ بەڕێوە دەچوون و دانیشتوانی کە ژمارەیان خۆی دەدا لە ۷۰ هەزار کەس بریتی بوون لە قزڵباش و[۱]. (ب) و ئەرمەنی و کورد و وەکو هەڵۆیەکی سرک و تیژ باڵ چنگی بەبناری یەکێک لە باڵەکانی چیای تۆرۆسەوە گیر کردبوو. تەختاییەکانی بەردەمی دەچنەوە سەر هەندێ بڵندایی بەسەریەکداکەوتوو کە هی هەزارەها ساڵەی پێش مێژوون. ئەتوانم بڵێم لە هیچ جێگایەکی تری ئەم سەرزەمینە دێرینەدا شوێنی ئەوها هەڵەت و دۆڵ و شیواوی و پێچ لەسەر پێچ و ڕەوەز لەسەر ڕەوەز نییە.

---

(1) Cf. Captain Molyneux - Seal:
Dersim in the Journal of the Royal Geographical Society, July 1914, and Ewald Banse: Die Turkie, 1915,...215, 217.

هەمیشە نەیاری و گێرمە و کێشە و لێک بەگومانیەک لە نێوان میریی دەسەڵاتداری دەرسیم و هۆز و خێڵەکانی دەوروبەری لەسەر باج و بەرات و سەربازگیری هەبووە. ئەم جارەیان دەست پێشخەر ئەم هۆز و خێڵانە نەبوون بەڵکو دەوڵەتی تورک بوو کە ئارەزووی لێ بوو سوپاکەی تاقی بکاتەوە. ساڵی ۱۹۳۷ تەنگەبەرەکانی ناو چیاکانی دەرسیم لە لایەن تورکەکانەوە گیران و داوا لە هەندێ پیاوماقووڵ و سەرۆک خێڵی ناوچەکە کرا بەزووترین کات بێنە بارەگای لەشکر تا بۆ ئەنقەرە ڕەوانە بکرێن. دیار بوو مەسەلەکە لە دەستکردنەوە و پێکدادان و بەگژی یەکدا هاتن بەولاوە چارەیەکی تری نەبوو. سەرکردەکانی ناوچەکە کە بینیان هەر چوار لایان بەلەشکر و تۆپخانە و فڕۆکە گیراوە لەسەر ڕەفتاری سەدان ساڵەی باو و باپیرانیان ناچار مان خۆیان و خێڵەکانیان بەرەو بڵندایییە هەرە بەرزەکانی چیاکان بکشێنەوە و خۆیان لە دۆڵ و شیوە سەختەکاندا قایم بکەن؛ تورکەکان کە زانیان ناتوانن هیچیان پێ بکەن، هەموو ناوچەکەیان ئابڵووقە دا و ڕێگاوبانەکانیان توند گرت و تا بەهاری ساڵی ۱۹۳۸ چاوەڕێیان کرد لە سەرەتای بەهاردا دەستیان کرد بەبۆمبابارانکردنی گوند و دەوارگەکان بێ جیاوازی و بواردن بەتایبەتی بۆمباباران کردنی فڕۆکەکان لە ئاسمانەوە بەجۆرێک توند و بێ بوار بوو کە دەرەتانی لە خەڵکەکە بڕی بوو و شێخ سەعید کە پیرێکی هەشتا و دوو ساڵە بوو، ناچار خۆی و کوڕەکانی و پیاوە ماقووڵەکانی دەوروبەری خۆیان دایە دەستەوە و تورکەکان، پاش دادگاییەکی گاڵتەجاڕانە، حوکمی خنکاندنیان دا و دوانزەیان لێ لە سێدارە دان...

پاش ئەوە ڕۆژنامەکانی تورکیا تا چەند هەفتەی لەسەر یەک هەر بالۆرەی «ئیتر دەرسیم نەما De Lenda est Dersimo»یان لێدا.

دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا لە لایەکەوە دەستی یارمەتییان بۆ تورکەکان، ئەو گەلە بیابان نشینە لە ئاسیای ناوەندەوە هاتووە بەچەک و پارە و بەهەموو شێوەیەکی تر درێژ دەکرد، تا بتوانێ چەند ڕەگەزی ڕەسەنی

خۆ وڵاتی وەکو کورد، ئاسووری، ئەرمەنی تەفروتونا و ڕیشەکەن بکا کە زیاتر لە (٤٠٠٠) ساڵەوە لە سەرزەمینی خۆیاندا نیشتەجێ بوون، لە لایەکی ترەوە خیانەتیان لەم گەلانە کرد و بۆ مەبەست و ئامانجی گڵاوی خۆیان بەفریویان دان. تەنها تۆزقاڵێک هەستی شەرەف، هەندێ وشەی بەتاڵ و درۆی کەمتر و نەختێ ڕاستی و دادپەروەری لە ڕەفتار و کردارییاندا دەیانتوانی ببن بەبەربەست لە بەردەم چەندین لێقەومان و ماڵوێرانیی گەورەدا.

## بارودۆخی سیاسی ئەمڕۆی کورد

لە جیهانی سیاسەتی پڕ لە بەند و باو و چەنەبازیی بەتاڵی ئیمڕۆدا، کوردستان لە ناوێکی جوگرافیایی بەولاوە هیچی تر ناگەیەنێ. لە هیچ مەڵبەندەکانی سەرزەمینی مێژوویینی گۆتۆ یان کاشو یان بوهتاندا بوونێکی خۆیی کورد نییە کە حوکمڕانی ڕۆڵەکانی بکا ئەوەی لێ دەرچێ کە هێشتا خێڵ و هۆزەکان هەر خاوەن دەسەلاتن لە ناوچەکانی خۆیاندا چونکە لە ئاکامی پەیماننامەکانی ئاشتی سالانی ١٩٢٠ - ١٩٢٣دا. هەموو سەرزەمینی کوردستان بەسەر ولاتانی تورکیا، عێراق، ئێران و سووریادا دابەش کرا، جگە لەو نزیکەی (٨٠) هەزار کوردەی کە لە سەردەمانێکی دوورەوە لە کۆمارە سۆڤییەتییەکان و ئەرمەنستان و ئازەربایجان نیشتەجێ بوون لە کاتێکدا بەر لە جەنگی (١٩١٤ - ١٩١٨) ولاتەکە تەنها بەدەستی عوسمانلی و ئێرانەوە بوو.

هەرچەندە ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی خراپ و ستەمکار بوو، بەلام لە ڕووی ئابوورییەوە یەکپارچە بوو کە تێیدا ئالوگۆڕکاری بازرگانی و شێوەکاری ئەم ئالوگۆڕکارییە چەندین سەدە بوو چەسپی بوو. هۆز و خێڵە کوردەکانی دەشتاییەکانی میزۆپۆتامیا لەسەر داب و نەریتێکی هەزار ساڵەی پشتاوپشت هاتوو، مەڵبەندە قشلاخییەکانیان هەر ساڵە لەگەڵ سەرەتای بەهاردا بەجێ دەهێشت و مەڕوماڵاتیان پێش دەدا و ڕووەو بنار و بەندەنەکانی باکور دەکەوتنە ڕێ تا خۆیان دەدا لە دامێنی خوارووی گۆلی وان. بەلام لە ساڵی ١٩٢٤ بەدواوە و دوای دروستبوونی سنووری سیاسی لە نێوان تورکیا و عێراقدا، ئیتر تورکەکان نەیانهێشت کوردە دەوارنشینەکان ئەم مافە ڕەوا و کۆنەی خۆیان بەکار بێنن و ژیان، یا نەریتی کۆچەری خۆیان بەگوێرەی وەرز و لەوەڕ و پێویست بەرنە سەر. بەهەمان شێوە عێراقیش ئەم مافەی لە کوردی تورکیا بڕی. هەر ئەم لێک دابڕانە خۆی و ئاکامە پڕ لە زیانەکانی لەسەر ژیانی ئابووری و دەستکەوتی

کزی خێڵە کۆچەرەکان تاقە هۆی نائومێدبوونی کورد و دانەسەکنان و شۆڕش کردنی بەردەوامیان نەبوون، چونکە سەرباری ئەم هۆیانە، تورکەکان هێزێکی بێ ڕەزا و گرانیان خستە سەر سنوورەکان بۆ ئەوەی چەپۆکی دەوڵەت بەسەر کورددا هەر بەوەشاوی بمێنێتەوە و سەربەستی گەڕانیان بەدوای لەوەڕدا لێ ببڕێ و جموجوولیان بەتەواوەتی ئیفلیج بکا، ئەگەرچی ئەم دەوڵەتانە لە بارەی بلاوکردنەوەی هەر زانیارییەکەوە لەسەر مەسەلەی مافی دێرینەی ئەم خێڵ و هۆزانە لە هاتوچۆکردنی بێ تەگەرە و کۆسپی ئەمبەر و ئەوبەری سنوور بەدوای لەوەڕدا تا بڵێی ئاگادار و سرک و کەم دوون، هێمان وەکو دەرئەکەوی، دزە ڕێگا، هەرچەند کەمتر و لە ژێر هەندێ هەلومەرجی سەختگیرانەی تریشدا بێت، هەر ماون.

بەلام کێشەی سیاسی کوردستان و دوارۆژی نەژادی کورد هەر وەکو خۆی ماوەتەوە؛ واتە گیروگرفتێکی گەورە و برینێکی خوێن نەوەستاو ئەو دەوڵەتانەش کە لە مەسەلەکەوە گلاون بیانەوێ یان نا دەبێ چارەسەری بکەن. هەروەها ئۆبالێکی زۆر دەکەوێتە ئەستۆی هێزە هاوپەیمانەکان کە یەکییەتی ئابووری ولاتی عوسمانلییان شکاند و گەلی کوردیان بەتەنهایی و دۆڕاوی لە مەیداندا هێشتەوە. بەگوێرەی ئەوەندە زانیارییەی کە لە سەرچاوەی لێپرسراوەوە وەدەست کەوتووە، سەرکردە کوردەکان، هیچ داواکارییەکی سنوورییان لەگەڵ ئێراندا نییە، ئەگەرچی لە چوارچێوەی ڕووداوەکانی ئەم دواییەی ئازەربایجانی ئێراندا گەلە هۆزە مەزنەکەی موکری و بڵباس و شکاک و هی تر کە لە باشوور و ڕۆژئاوای گۆلی ورمێ نیشتەجێن و هەموو خاوەن پلە و پایەی مێژوویی دێرینەن، بانگی سەربەخۆیییان هەڵدا و شاری مەهابادی هەرێمی ساوجبولاقیان[1] کرد

---

(١) هێشتا بەتەواوی دیار نییە ئایا ئەم دەوڵەتە کوردە بەتەواوەتی سەربەخۆیە، یان هەرێمێکی ئۆتۆنۆمییە لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئێران یان ئازەربایجانی ئۆتۆنۆمییدا، گەلە هۆزە مەزنەکەی تر کە لە لوڕەکان (لوڕستان) و ئەردەلانییەکان کە (سنە شاری هەرە مەزنیانە) و کە لە دەرگاکانی هەمەدانەوە دەست پێ دەکەن و هەندێ خێڵی =

بەپایتەخت. گەلە هۆزەکانی کوردی عێراق بریتین لە پاشماوە و ماک و ناوکی پادشایەتی دێرینەی گۆتۆ و ئیمڕۆش هەر خانەدانترین و کۆنترین خانەوادەی ڕەگەزی کورد پێک دێنن. ئەمانە بریتین لە بابانەکانی سلێمانی، هەورامییەکان، سوهرانییەکان (یا سۆرانییەکان)، هەمەوەندەکان و جافەکان، ئەو کۆمەڵە هۆزە گەورەیەی کە بەناوی گۆرانەوە ناسراون، ڕەوەندەکانی ڕواندز و دەربەندی کێلەشین و دەم سنوورەکانی تورکیا. لە قەدپاڵەکانی خوارووی چیای جوودیەوە تا دوورگەی ئیبنی عومەر و سنووری تورکیا مەڵبەندی شەش هۆزی هەفتانبوختی ناو مێژووی پەهلەوی ئەردەشێری بابەکانە کە دەقاودەق هەمان بەشی باشووری سەرزەمینی بابخی (بوهتان یان بوتان)ە کە لە لایەن پادشاکانی ئاشوورەوە باسیان کراوە.

تیرەی گەورەی یەزیدی ئایینی سنجار، کە چیایەکی لە زنجیرە براوی ڕۆژئاوای باکوری پادشانشینی عێراقە، تا ئێستا خۆی لە هەموو بزووتنەوەیەکی سیاسی دوور گرتووە. هەموو ئەو تاکوتەرا گەڕیدە ئەوروپاییانەی کە سەریان لە یەزیدییەکانی کوردستان و ئەرمەنستان داوە، بەخراپی و بەدفەڕی باسی ئەم خەڵکە ڕوح سووک و دڵێرەیان کردووە. دیارە گەڕیدەیەک کە لە زانیاری گشتی بەولاوە هیچی لە باخەڵدا نەبێ، ئەوەندە لە بارەی ڕابردووی مێژوویی و پاکیزەیی و ڕۆشنی باوەڕی دێرینەی یەزیدییەکانەوە ئاگادار نابێ و لە مانای داب و ڕەسمی ئایینیشیان سەر دەر ناکا.

---

= وردتری وەکو سنجابی، کەڵهوڕ و هی تر کە بەسەر ڕێگای بەغدا و کرماشاندا دەستیان دەڕوا وەکو دەردەکەوێ لە ناو خۆیاندا، هاوپەیمانییەکی یەکجار تێکسمراو لەگەڵ دەوڵەتی ئێرانیشدا هاوکاری تەواویان هەیە.

## کوردەکانی سوریا و لوبنان

هیچ سەرچاوەیەکی بەڵگەدار بەدەستەوە نییە کە بکرێ بەبنەڕەت بۆ دانانی ژمارەی ئەو سەرکردە و فەرماندە کوردانەی سوڵتان سەلاحەدین کە لە دیمەشق و حەلەب و شارەکانی تری سوریادا پاش مردنی سوڵتان جێ نشین بوون جگە لەمە، لە هەندێ نووسراوی بزماریی سەرخشتی سوورەوە کراوەوە وا دەردەکەوێ کەوا لەو سەردەمەدا «کۆیلەی ڕەزا سووکی»ی خەڵکی وڵاتی گۆتۆ لە شارە سۆمەری و بابلییەکاندا زۆر باو بوون. بەهەمان شێوەی ئەمڕۆ کە لە شارەکانی عێراق و سوریا گەلێ کورد و نەتەوەی تری چیایی کار دەکەن و بەپیشەی وەکو بیرهەڵکەنی، باخەوانیی، نانەوایی و باربەریەوە دەست لە کاردان. لەو کاتەشەوە کە هۆزەکانی کورد، چ لە لایەن دەوڵەتی عوسمانلی و چ لە لایەن تورکیاوە کەوتوونەتە بەر هێرشی تەنگ پێ هەڵچنین و بەدرەفتاری. کوردێکی زۆری ئەو سەرزەمینە ڕژاونەتە سوریاوە و لەوێ بەفەلاحەتی و ئاژەڵداری و کاسبکاری ترەوە لەو سەرزەمینانەدا دەژین کە دەکەونە ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگای شەمەندەفەری سوریا و عێراقەوە، بەتایبەتی لەو گۆشەیەدا کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای عێراق و[1] باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە.

(١) لە ئەسڵەکەدا نووسراوە باکوری ڕۆژهەڵاتی عێراق کە دیارە هەڵەیە - وەرگێر -.

# کێشەی کورد لە تورکیا

یەکێک لە دیاردە هەرە سەیرەکانی سیاسەتی جیهانیی ئەم سەردەمە، ئەوەیە هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە لەگەڵ تورکیادا هاوسنوورن، چ زۆر و چ کەم، گیروگرفتی سنووریان خاکیان لەگەڵیدا هەیە. جگە لە داواکارییەکانی وڵاتەکانی بەڵقان و سوریا و کورد و ئەرمەنییەکان و گورجییەکانیش هەموو ئەو دەوڵەتانە داواکاری بەڕەسمی ناسراویی نێودەوڵەتییان لەسەری هەیە.

سەرزەمینەکانی گۆتۆ، کورد، کوردستان، وڵاتی ئاشوور، ئەرمەنستان، ئیبەریا (قەفقاسیا)، سوریا، هەموو ناوی مێژوویی خاوەن ڕابردووی پرشنگدارن و هەموو لە کتێب و بەڵگە مێژووییەکاندا بەروون و ئاشکرایی جێگای خۆیان هەیە و هەموو قوتابییەکی مێژوو کە شارەزایی لە سەرچاوە کلاسیکییە یۆنانی و ڕۆمانییەکاندا هەبێ بەئاسانی دەستیان دەخاتە سەر. جگە لەوە هەر کەسێک کە ئاستێکی هاکەزایی زانیاری هەبێ دەتوانێ پەنجە بخاتە سەر شوێنەواری وەکو لیدیا، فریجیا، یان کاپادۆشیا و باسی ئەفسانە و چیرۆکە میللییەکانیان بکا، بەڵام ئەو ناوانەی ئێستا بەو شوێنەوار و سەرزەمینانە دەوترێ، ئەمڕۆ ئەوەندە بەلای کابرایەکی بێ لایەنەوە بایەخدار نین، تەنانەت ئەو کەسانەش کە بەبنەچە خەڵکی ئەو سەرزەمینانەن بایەخێکی ئەوتۆیان نادەنێ. هەر چوار خاک و سەرزەمین داواکەرەکەی سەرەوە هەموو بێ جیاوازی لەو باوەڕەدان کەوا دراوسێیەتی تورکیایەکی بەهێز و سەربەخۆ بۆ هەریەکەیان «بایەخێکی یەکجار گرنگی» هەیە و هەموویان هەر کاتە داواکارییە ڕەواکانیان جێبەجێ بکرێ، دەتوانن پێکەوە قۆڵی لێ هەڵماڵن و بناغەی کامەرانی و بەختیاری بۆ خۆیان داڕێژن، هەروەکو بەدرێژایی چەندین سەدەی ڕابردوو کردوویانە.

لەم داواکارانە تەنها کورد خاوەنی قەوارەی نیشتمانیی خۆی نییە خانە

و کاشانەیەکی شوورەداری خۆی نییە کە هەموو خۆشەویستی و توانای خۆی بۆ تەرخان کا و بەهرە و زانیاری خۆی بۆ بەخت کا. ئاوات و ئامانجی سەرکردە نیشتمانپەروەرەکانی خۆیبوون هەر ئەوە بوو چمکێکی سەرزەمینی مێژوویی باو و باپیرانی خۆیان بەدەستەوە بێ، کە تێیدا بەئازادی و بێ دەست تێوەردان و خۆ هەڵقورتان یان کۆسپ دانانی هیچ دەرەکییەک منداڵەکانیان بەزمانی زگماکی خۆیان فێر کەن، کتێب و رۆژنامە دەرکەن، چیرۆک و فۆلکلۆرە زۆر و زەبەندە میللییەکانیان کۆکەنەوە و لە چاپی دەن، مێژووی کۆن و نوێی خۆیان بخوێنن، یاسا بۆ خۆیان دارێژن و خۆیان بەوپەڕی توانا و کارامەییەوە خۆبەخۆ حوکمڕانی بکەن. ئایا هێزە مەزنەکانی جیهان تەنانەت ئەم کەمترین پایەی «ئازادی»یەش بەم گەلە ئازا و دلێرە ڕەوا نابینن؟ کرداری خوا وای کردووە کە ڕەگەزی کورد بەدرێژایی چوار هەزار ساڵی ڕابردوو بەسەر ئەم کێو و هەڵەت و بلندایییانەوە، کە گرنگی و بایەخێکی جیهانی تا بلێی فراوانیان هەیە، بمێنێتەوە و بەبێ ئەوەی هیچ هێزێک بتوانێ جێ لەقی بکات، بەچنگ و نینۆک خۆی پێوە بلکێنێ، تا ئێستا سەرژمێرییەکی ڕاست و ڕێکوپێک لە تورکیا نەکراوە. گابرێیل ئەفەندی نۆرۆدۆنکیان، کە بەدرێژەی چل ساڵ ڕاوێژکارێکی یاسایی دلسۆزی دەرگای بلند هەروەها سەناتۆر و وەزیری دەرەوەش بووە، ساڵانی (١٩١٢ - ١٩١٣) بۆی گێڕامەوە کە لە ساڵانی پێش (١٩١٤)دا تورکەکان سەرژمێری گشتی دانیشتوانیان بەم جۆرە کرد: ٢٥ ٪ی ژمارە گشتییەکەیان دەخستە سەر ژمارەی تورکەکان و ٢٥ ٪یان لە ژمارەی هەموو ڕەگەز و نەتەوەکانی تری دانیشتووی ئیمپراتۆریەت دادەشکاند. کە بیروڕایم دەربارەی یەکەم سەرژمێریی کە لە ساڵی (١٩٢٧)دا دوای هاتنە سەر کاری ڕژێمی کۆماری کرا پرسی وتی:

تورکەکان لە نێوان ١٩١١ و ١٩٢٣دا ئەوەندەیان لێ فەوتا، ئەمجارە کە سەرژمێرییان کرد ٥٠ ٪یان خستە سەر ژمارەی تورکەکان و ٥٠ ٪یان

له ژمارەی نەتەوەکانی تر داشکاند. له تۆمارێکی رێکوپێک و ڕاستدا[1] له بارەی تورکیاوە کە ساڵی (١٩١٥) له لایەن ڕاوێژکارێکی ئەڵمانی وەزارەتی ناوخۆی تورکیاوە بڵاو کراوەتەوە، ژمارەی گشتی کوردەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە(٨٠٠) هەزار کەس دانراوە. ئەم ژمارەیە تا بڵێی له ڕاستییەوە دوور و کورتی هێناوە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوە بخەینە حیسابەوە کە کوردەکانی عێراق و سوریاشی تێدایە. پاش ڕاگواستنەوە و ڕەشەکوژی و دەربەدەرییەکانی دوای هەرسێ ڕاپەڕینەکە، زۆر گرانە تەنانەت ژمارەگیرییەکی نزیککراوەش بخەینە ڕوو. ئەو لیژنەیەی «ئەنجومەنی گەلان» کە له بارەی ناکۆکییە سنوورییەکانی ناوچەی موسڵەوە هاتە کوردستان ژمارەی گشتی کوردی بەم شێوەیە داناوە:

| | |
|---|---|
| تورکیا | ١,٥٠٠,٠٠٠ |
| ئێران | ٧٠٠,٠٠٠ |
| عێراق | ٥٠٠,٠٠٠ |
| سوریا و شوێنی دی | ٣٠٠,٠٠٠ |
| سەرجەم | ٣٠٠٠,٠٠٠ |

ئەوەی شایانی باسە کە له ڕاپەڕینەکانی ساڵی ١٩٢٥ و بەتایبەتی له ڕاپەڕینەکانی ١٩٣٠ - ١٩٣٢دا کوردێکی زۆر کەوتە بەر شاڵاوی کوشتار و ڕاگوێزانەوەی بەکۆمەڵی یەکجار فراوان و توند.

(1) P. krause: Turkei, p. 28.

## کوردەکانی قەفقاسیا

نزیکەی (٨٠) هەزار کورد و یەزیدی لە هەرسێ کۆمارە سۆڤیەتییەکەی قەفقاسیادا نیشتەجێن. زۆربەیان لە ئەرمینیا دەژین و بەوەبەرهێنانی مەڕومالاتەوە لە لەوەڕگاکانی چیای ئەڵەگەز و شیو و دۆڵەکانی دەوروبەرییدا خەریکن. ساڵی ١٩٢٧ ئەلفبایەکی تایبەتی بەپیتی لاتینی بۆ کوردەکانی سۆڤیەت دانرا و لە شاری یەریڤان ئامۆژگایەکیان بۆ ڕاهێنان بۆ کرایەوە. لەوێ قوتابخانە و مامۆستای تایبەتی خۆیان هەیە جگە لە شانۆ و ئەنجومەنی پێشاهەنگان. لەم دواییەدا باسی ئەوە کرا کەوا نووسەرە کوردەکان داستانی بەناوبانگی «مەم و زین»یان[1] کردووە بەدراما و لە شانۆکانی خۆیاندا پێشکەشیان کردووە. هەوڵ دراوە بۆ بڵاوکردنەوەی فۆلکلۆری کوردی کە لە سەدەها گۆرانی و شیعر و قسەی پێشینیان و قسەی نەستەق و چیرۆکی ئاژەڵ و زیندەوەران پێک دێ. لە سوریاش پیتی لاتینی بۆ نووسراوە کوردییەکان بەکار دێنرێ، لە کاتێکدا لە عێراق و ئێران پیتی عەرەبی لە کار دایە.

---

(١) لە ئەسڵەکەدا نووسراوە «Zin u Min» کە دیارە هەڵەیە و مەبەست «مەم و زین»ە. - وەرگێڕ -.

شێخ عوبەیدوڵلای ڕێبەری ئابڕوومەندی ئایینی، ساڵی (١٨٨٠) لە نووسراوێکی نهێنیدا بۆ کۆنسوڵی بەریتانیا ڕاستیی ئایین و بڕوای گەلی کوردی[1] بەم جۆرە باس کردووە: گەلی کورد گەلێکی جیاوازە. ئایینی لەگەڵ ئایینی (خەڵکی تردا) جیایە هەروەها یاسا و داب و نەریتی جۆرێکی ترن. گەر شێخ ڕووی قسەی لە بارەی ئایینی نەتەوەی کوردەوە لە خەڵکەکەی دەوروپشتی بووایە، بێ گومان دەیوت: «ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد موسڵمانی سوننی مەزەبن و تا بڵێی بۆ ئایینی ئیسلام گوێڕایەڵ و دڵسۆزن». ڕاستییەکەی گەر مەبەست ئەو کوردانە بن کە بەدەم نیشتەمەنی عەرەبەکانەوە دەژین تا بڵێی قسەکانی شێخ ڕاست و دروستن، ئەگینا کوردی شوێنانی تر لە ڕووی باوەڕ و پەرستشەوە، ئەوەندە بەتەنگەوە نین. زۆر کورد بەوپەڕی وردی و گوێڕایەڵییەوە لە نوێژی جەماعەتدا بەشداری دەکەن و فرمانە ئایینییەکانی تر بەجێ دێنن، بەڵام گەلێکی تریشیان سەر لە چاک و پیر و زیارەتگا دێرینەکانی گاورەکان دەدەن و نەزریان بۆ دەکەن.

لەمەڕ مەسەلەی ئایین و ڕێبازەوە دەبێ بەیەک چاو سەیری ئەو کوردانە نەکرێ کە لە شارەکاندا دەژین کە مزگەوتیان تێدایە لەگەڵ ئەو کوردانەدا کە ڕەوەندن یان ئاوایی نشینن. لە ڕۆژانی تواناداری و هاتنی دەوڵەتی عوسمانلیەوە تا سییەکانی سەدەی ڕابردوو، گەلێ دەسەڵاتدار و سەرداری کورد بۆ حەج دەچوون و لەوێ فێری قورئان دەبوون کە بەعەرەبی نووسراوە بەڵام لەو کاتەوە چ تورکەکان و چ فارسەکان گیرۆدەی لاوازی و بێ دەسەڵاتی بوون و خۆیان کوتایە بن باڵی حکوومەتە گاورەکانی سەردەمەوە ئیتر ئەمانیش لە چوونە حەج و فێربوونی قورئان ساردەوە بوون. جگە لەمە کەشکەگیری کوردان بۆ ئیسلام یان ساردەوەبوونیان لێی، یان دروستبوون و دابەشبوونی مەزەبی لە ناویاندا بەتەئسیری بارودۆخی ئەم ناوچە یان ئەو

---

(١) بڕوانە ف (٤).

ناوچە یان ئەم هەرێم و ئەو هەرێم یان لەبەر هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە ئایین ناتوانێ هەموو گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکا، شتێکی باو بووە لە ناویاندا، بەڵام، سەرەڕای هەموو ئەمانە، باوەڕداریی بەوەی کە خودایەکی مەزن و یەک ڕەنگ و بەتوانا و بێ ژووردەست هەیە ڕەگێکی قووڵی ئەوتۆی لە ناو هەموو کورداندا هەیە کە هەرگیز لە کەندن نایەت.

یەزیدییەکان لەمەڕ مەسەلەی ئایین و داب و ڕەسمی ئایینییەوە بەتەواوەتی لە کوردەکان جیان. ئەوان خاوەنی کتێبی ئایینی تایبەتی خۆیانن کە بەکوردی و عەرەبی نووسراوە، بەڵام بەهۆی تەنگ پێ هەڵچنین و ستەمکاری و ڕەشەکوژکردنی چەند جار لەسەریەکەوە لە لایەن تورکەکانەوە، ئەو کتێبە هەر بەنهێنی ماوەتەوە لە ناویاندا و تا ئێستا نوسخەیەکی ساغکراوەی نەکەوتوتە دەست کە بکرێ بەسەرچاوە بۆ باس و لێکۆڵینەوە[1]، ئەگەرچی هەوڵێکی زۆر دراوە کە وەرگێڕرێتە سەر زمانە ئەوروپاییەکان. بنەڕەت و شێوەکاری پەرستش و نهێنییەکانی بەجێهێنانی داب و ڕەسمی ئایینەکەیان ئاسان و ساکارێکی ئەوتۆ نین، کە هەندێ کەس باسیان دەکەن. هەڵەیەکی گەورەیە بەشەیتان پەرست ناو ببرێن بێ گەیشتن لە ئایینەکەیان و لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەی چاک لە بارەیەوە.

ئەو منە کردن و هەڵکۆڵینانەی کە لەم سی ساڵەی دواییدا کران، پەردەیان لەسەر ناوی نەک تەنها ئەو وڵات و دەوڵەتانە هەڵماڵی کە لە بیر چووبوونەوە، بەڵکو تیشکی ڕووناکیان خستە سەر هەندێ ڕەگەزی کۆن و دێرینیش. ئەو شتانەی کە هاتنەوە دەست نەک کێشە کۆنەکانیان هەر بنەبڕ نەکرد، بەڵکو کێشەی تریشیان خستە سەر. شێوەی لەش و ڕوخساری ئەو

(١) ئیسماعیل بەگی چۆل (میری شەنگار): «ئێستا و ڕابردووی یەزیدییەکان» ئەم کتێبە لە سێ فەسڵ دایە و لە بارەی داب و ڕەسمی ئایینی و هەندێ ڕووداوی پەیوەندیدار بەیەزیدییەکانەوە باس دەکا. ساڵی ١٩٣٤ لە لایەن (قسطنطین زریق)ەوە لە بەیروت لە چاپخانەی ئەمەریکی چاپ کراوە، کتێبی تریش هەن لە بارەی یەزیدییانەوە کە هێشتا چاپ نەکراون.

کەسانەی کە پەیکەرەکانیان دۆزراوەتەوە، هی ڕۆژهەڵاتی دێرین و بەتەواوی کوتومت، هەمان شێوە ڕوخساری دانیشتوانی ئەمڕۆی ئەو هەرێمانەن. لە سەدەی چواردەیەمی پێش زاییندا، مەگەر بەدەگمەن ئەگینا تێکەڵبوونی ڕەگەز ڕووی نەداوە. هەروەها لەم سەردەمانەی دواییشدا مەگەر بەدەگمەن ئەگینا تێکەڵبوونی ڕەگەز لە سەرزەمینە چیاییەکاندا نەهاتۆتە دی، بەڵام سەرەڕای ئەم ڕاستییانە، جۆراوجۆری ڕوخسار لە ناو هۆزە کوردەکاندا مایەی سەرسوڕمانە. کوردەکان بەگشتیی میللەتێکن کە زۆربەیان سەریان درێژە و تیپی دەموچاویان زەقە، چاو و موویان ڕەشی مەیلەو قاوەییە و زۆرتر لووتیان بەرانیە. لە هەمان کاتدا، زۆری چاوشین و قژکاڵ، یان چاو و موو ڕەشی لووت باریک و ڕاستیشیان تێدایە. ئەم جۆراوجۆری ڕوخسارە هیچ پەیوەندییەکی بەتێکەڵبوونی ڕەگەزەوە نییە، چونکە هی کۆمەڵە هۆزێکن کە لە چەند سەدەی یەک بەدوای یەکدا بەوە ناسراون کە ژیانێکی دوورەپەرێزیان بردۆتە سەر و لە دراوسێکانیان بەولاوە پەیوەندییان لەگەڵ کەسی تردا نەبووە و هەر ئەم تیپی ڕوخسار و شێوەیە هەمان ئەو تیپی ڕوخسار و شێوەیەیە کە بەگشتی بەتیپی ئەرمەنی ناسراوە. بەگوێرەی بیروڕای هەندێ زانای ڕەگەزناسی، خاوەنی ئەم جۆرە تیپی ڕوخسارە دەبێ دانیشتووی ئەو ناوچەیە بووبن کە لە دەریای ئیجەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە کێوەکانی زاگرۆس لە لایەکەوە، لە باکوری قەفقاسیا و خەزەریشەوە تا دەگاتە نۆکەندی عەرەبی لە لایەکی ترەوە. هاووێنەیان، حیثیەکان، خوریەکان، میتانیەکان، گۆتۆکان و ئیلامیەکانن و لەوانەیە سۆمەریەکانیش بگرێتەوە. تەنها سۆمەریەکانی لێ دەرچێ، ئەم گەلانە هەموو لە کۆنترین ڕەگەزی ئاریایین کە سەردارەکانیان بەعەرەبانەی تایبەتی جەنگەوە دەچوونە شەڕەوە و تەشویەی تایبەتی شەڕیان بەدەستەوە دەگرت. بەداخەوە، زانیارییەکی یەکجار کەم لە بارەی ئایین و داب و نەریتیانەوە لە دەست دایە، چونکە خاکەکانی ئەرمەنستان و کوردستان هێشتا زانیاری تەواوی ناو دەروونی خۆیان لەم بارەیەوە نەداوەتە دەستەوە.

## پێشکەوتن و گۆڕانکاری لە کەسایەتی کورددا

کــاردانەوەی ڕووداوە هەژێنەرەکــانی ئەم سی ســاڵەی دوایی لە ناو کورداندا، هەروەها لە ناخی شێوەی بیرکردنەوە و ژیانی کۆمەڵایەتیاندا، هەر وەکو هەمـوو گەلە ڕەسەن و مێژوویـیـەکانی تری ئاسـیـای ڕۆژئاوا، شۆڕشگێڕانە بوو - پڕ بەپێستی وشەکە. دەتوانرێ بێ یەک و دوو بوترێ کـە ئەم گـۆڕانە بنەڕەتیـانە زۆر مـایەی دڵخـۆشی و ڕەزامـەندی و باش تێگەیشتنی بێگانەکان نەبوون. کورد لە قۆناغی شەڕە هۆز و دووبەرەکیی خێـڵایەتیـیـەوە بەرەو پلەیەکی وریا و هۆشـیـاری نەتەوەیی، یەکگرتنی ڕەگەزیی ئەوتۆ پێش کەوتوون، کە پشتێک لەمەوبەر باوەڕ نەکردەنی بوو. هەر بانگەوازێک یان هاوارێک لە لایەن هەر ئەنجومـەن یان دەسـتـەیەکی نوێنەری کوردەوە بدرێ هەنگاوی خێرای بەپیرەوە ئەنرێ. ڕاستـە، گۆمەکە مەنگە و هیچ نیشـانەی شڵەقـانی بەسەرەوە دیار نییە، بەڵام هەڵەیەکی یەکــجــار گـەورەیە، گــەر وا دابنرێ لە بنیــشــدا هەروا بێ دەنگ و بێ غـەوغـایە. داب و ڕەسـمـە دێرینەکـان، ئەو نەریتـە سـەرەتاییـیـانەی کـە لە لایەن سـەدەها گـەڕیدەوە، ئای وەکـو شـتـێکی سەیر و باوەڕ نەکـردەنی یان وەکـو کـردەوەیەکی زشت و نـاڕێک باسی کـراون و وتراون و وتراونەتەوە، لەوانەیە لە شوێنەوارە دوور دەست و سەختەکاندا هەر وەکو خۆیان مابنەوە، بەڵام کام وڵاتە کە ئێستا بەپێشکەوتوو یان شارستانی ناسراوە، سەدەیەک لەمەوبەر هەمان حاڵی نەبوو؟ لەگەڵ ئەمـەشدا، ئەو کوردانەی کە بەر بای فـێرکردن کەوتوون و هەلومەرجی خوێندنیان بۆ ڕەخساوە بەلێهاتووییـەوە سەلماندوویانە کە لە هەموو لق و پەلێکی چالاکی مرۆڤایەتیـیدا، کارامە و دەست ڕۆیشـتـوون و لە هیچ کەسێکی تر کەمتر نین. ڕاستییەکی یەکجار گرنگ کە لە بارەی کوردانەوە دەبێ بسـەلمێنرێ ئەوەیە، سەرەڕای هەمـوو ئەو چەرمــەســەرێ و ناخــۆشی و تاڵـی و سـوێریە، کـە ئەمـە چەندین سـەدەی دووردرێژە لە ژێریدا دەناڵێنن، ئەوان هێــشــتــا هەر مــاون و لە

تاقــیکردنەوەی زەمــانە بەســەربەرزی و ســفت و ســۆیی و قــاڵەوەبوویی دەرچوون. ئیمڕۆ لەو گەلانەی لە سەردەمانی دێریندا هەبوون، نە حیثیەکان ماون و نە ئیلامییەکان، زۆر گەلی تریش ئاسەوار چییە نەیان ماوە، بەڵام لەو شوێنەواره جوگرافیاییەی کە چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر کوردەکانی گۆتۆی تێدا دەژیا، ئێستـاش هەر گەلی کورد دەژی و کەسی تر، ئەمڕۆش هەر وەکـو ئەو ڕۆژ و سـەردەمـە، کـوردان سـەربەرز و سـەردانەنەوێن و ورە بەرزن. لە بـاری ساخـڵـەمی لەشەوە، تەن دروست و لە بار و دوور لە هیچ نیشـانەیەکی دەمارگرژی و دڵەڕاوکێن، کابرایەکی کوردی ئاسایی لەگەڵ مەکینە و پیشـەکارییدا دۆست و تەبایە و دەتوانێ بەئاسانی جڵەوی هەر گیـروگرفـتێک بگرێتـە دەست و بەدوای خۆیدا بەکـاوی دڵ ڕای بێنێ و بکێشێ کا. کـورد بەدرێژایی چەندین سەدەی ڕابردوو خۆی بەچەکی وەکـو «سنجوق، ڕم و تیـروکەوان، قۆچەقانی و شـمشـێر» پاراسـتووە کە هەموو شـــایەدی ئازایەتی و دلێـــری ئەم مـــیللەتەن بەڵام لە دواڕۆژدا ئەمـــە بەدڵنیـاییەوە دەڵێم لە بەکارهێنانی فڕۆکە و زانسـتی کیمیـادا هەرگیـز لە گەلانی تر دوا ناکەون و کورت ناهێنن...

ژنی کـــورد، ســـروشت پاکن و کـــردگـــار چۆنی دروست کـــردوون هەروا ئاساییین، سادەن و تا بلێیی بەوێل و پوختەن بەڵام ڕوخسـاریان لووسکاری و ئارایشـتێکی ئەوتۆ نـادرێ کە بچـێتـە دڵی ڕۆژئاواییـیەوە. هەرکەسـە لە بۆچوونی خـۆیەوە دەڕوانێـتـە جـوانی لەش. گـەر بێـتـو پەروەردەکـردنی هاوچەرخیـان بۆ برەخسێ لەو مـافـووره جوان و بەرە نایاب و تەونکاری و جلوبەرگ و نەخش و نیگارانەدا کە دروستی دەکەن شاکار دێنن. ئەوانیش وەکو پیاوەکانیان هەستیان بەشیعر و مۆسیقا دێتە جۆش. لە زۆزانی هۆزی بەهێـز و هەیبەتی جیـرانیـان کـە لە داوێن و بناری چیـای بینگۆلی نێـوان مـووش و ئەرزەڕۆم دەژین دەمــەوئێــوارانێک لەبەر تیــشـکی مــانگەشـەو وێنەیەکم بینی. شایەرێکی کورد بەگۆرانی چیرۆکێکی خۆشەویستی دەوت کە تێـیـدا لاوێک بەتەنـهـا بەرامبـەر سی زەلام دەوەسـتێ کە بۆ لە دەست

دەرهێنانی یارەکەی هێرشی دەبەنە سەر. لاوەکە پاش ئەوەی دوا فیشەک دەتەقێنێ و بەسەختی بریندار دەبێ خەنجەرەکەی هەڵدەکێشێ و بەدەم باراندنی وشەی خۆشەویستی و وەفادارییەوە بەسەر یارەکەیدا، پەلاماری دوژمنەکانی دەدا. یارەکەشی بەتاسەوە پەیماندارى بۆ دووپات دەکاتەوە و برینەکانی تیمار دەکا. لەم کاتەدا کابرای شایەر دەنگی لێ هەڵبڕی بەجۆرێک کە هەموو دانیشتوانی دەوری کە سی ژن و پیاو دەبوون کەوتنە پەک و پووک کردن و هەندێکیان خۆیان بۆ نەگیرا و فرمێسک هۆن هۆن بەچاویاندا هاتە خوارەوە.

باوەڕ ناکەم شتێک هەبێ لەم جیهانەدا، کە کورد لە فێربوون و جلەو گرتنییدا، لە هیچ یەکێک لە دراوسێکانیان دوا بخات. ئەم لێوەشاوەیییە زگماکەیان، بەرە بەرە زیاتر بەرەو نارەزایی سیاسی پاڵیان دەدا. بەتایبەتی کە بەچاوی خۆیان دەیبینن ولاتەکەیان بەسەر دراوسێکانیاندا دابەش کراوە و شتاقیان تەنانەت مافی خۆ بەڕێوەبردنیشیان پێ ڕانابینن. کورد بەزمانێکی ئاریایی دەدوێن کە زۆربەی وشە ڕەسەنەکانی لەگەڵ وشە هیندۆ ئەوروپییەکاندا یەکن یان لێک دەچن.

ساڵی ۱۹۲۷ خۆیبوون بانگەشەی سەربەخۆیی کوردستانی دا و شاری دیاربەکری کردە پایتەخت. بەڕاستی دانانی دیاربەکر بەپایتەخت هەڵبژاردنێکی بەجێ بوو چونکە گەر لە دابەشکاری ئەمڕۆی کورد وردبینەوە دەبینن دیاربەکر دەکەوێتە ناوەڕاستی کوردستانەوە گەلی کورد لەو سەرزەمینەدا دەژی کە دەکەوێتە چوار دەوری شاری مەلاتیای سەر ناوەڕاستی ڕووباری فورات و ئەو ناوچانەی بەدەوریەوەن هەروەها بلندایییەکانی زنجیرە چیای تۆرۆس و هەڵەتەکانی ئەمدیو و ئەودیوی، ڕۆخەکانی ڕووباری دیجلە تا دەگاتە دوورگەی ئیبن عومەر ولاتی دێرینی گۆتۆ و کاشییان شارەزووری سەدەکانی ناوەڕاست. پەیمانی سیڤەری ساڵی ۱۹۲۰ بەباشی و ڕاستی سنوورەکانی کوردستانی بەگوێرەی واقیعە ڕەگەزی و ئابوورییەکانی ئێستا دەسنیشان کردووە.

مێژووی ئەم جیهانە بریتییە لە سەرگوزەشتەی گەلانی. لە پەنای ئەم توانا بەشەریە گەورەیە و ئەم سەرچاوە سروشتییە زۆر و زەبەندەی کە ئەم سەرزەمینە هەیەتی، پیاو زۆر بەگرانی دەتوانێ خۆی هەڵخەڵەتێنێ کە گەلی کورد مل بۆ ئەو بارە نالەبار و ژێردەستەیییە دەدا کە ئێستا تیایەتی. کوردان خۆیان دەزانن ڕەگیان چەند قووڵ بەناخی ئەم سەرزەمینەدا داچووە کە هەموو جیهان بەهی ئەوانی دەزانی، لە کاتێکدا ئەو ئیمپراتۆریەتانەی، چ لە ڕۆژئاوا، یان چ لە ڕۆژهەڵاتیاندا هەن، بەدرێژەی چەندین وەچەی یەک لە دوای یەک هەر خەریکی نانەوەی گیروگرفت و گرێ کوێرەی دەروونی و سیاسی بوونە بۆیان.

## تێبینییەکان

### فەسڵی یەکەم:

(أ) کورد و کورت: باشترین دەرخەری هەڵوێستی گشتیی هەردوو ئیمپراتۆربەتی دراوسێی کورد، واتە ئیمپراتۆربەتی فارس و ئیمپراتۆربەتی عوسمانی بەرانبەر بەم گەلە، یاری کردنێکە کە بەوشەی «کورد» کراوە. تەنها بەرێکەوتێکی سەیر وشەی «کورت» چ بەتورکی و چ لە زمانە ئێرانییە نوێیەکاندا[1] واتە «گورگ». وشەناسە نوێیەکانی هەردوو ئیمپراتۆریەت پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر، گوایە نزیکایەتییەکی ڕیشەییان لە نێوان وشەی «کورت» و وشەی «کورد»دا بەدەست کەوتووە ئەم بۆچوونە لە تەپڵی سەرەوە تا نووکی پێ پووچ و بێ بناغە و ساختەیە. بەڵام لە ناوەخندا شتێکی تر دەردەخات، واتە ڕەنگدانەوەی ئەو تیوریە سیاسیەیە کە هەر جار نا جارە دەوڵەتی تورک بەرەفتار و کردار بەرانبەر بەگەلی کورد دەری دەبڕێ...

یەکێک لەو ڕاستیانەی کە نزیکایەتی یان یەکیەتی نێوان زاراوەی «کورت»ی تورکی - فارسی و «کورد» دەداتە دواوە و پووچەڵی دەکاتەوە ئەوەیە سەرزەمینی گۆتۆ - کوردستان و گەلەکەی دوو هەزار ساڵ بەر لەوەی وڵاتی فارس یان عوسمانی ناویان بێتە ناوانەوە، هەبوون و پادشایەتییەکی سەربەخۆبوون بەبەڵگەی مێژوویی باوەڕ پێ کراو ئێستا دەتوانرێ ئەوە بسەلمێنرێ کەوا ئەو لێکدانەوەی کە بەوشەی «کورد»ەوە هەڵبەستراوە بەتەواوەتی ساختە و بێ بناغەیە. ئەم بیروڕایە بەڕای من ڕەنگدانەوەی ئەو ترس و ژارەیە کە هەردوو ئیمپراتۆریەت بەرانبەر ئەم گەلە سەردانەنەوێنە پەستوویانەتە دڵەوە، کە خۆی لە چیا سەختەکانی توند قایم کردووە و سەری نۆکەریی بۆ هیچیان شۆڕ نەکردووە.

---

(١) پێم وایە لە هیچ زمانێکی نوێی «ئێرانییدا» کورت «مانای گورگ» نییە تەنها لە تورکییدا «کوورت - قوورت» واتە گورگ. - وەرگێڕ -.

(ب) سەرزەمینی گۆتۆ کویّ دەگریّتەوە: لەو ناماژەکردنە تەمومژ گرتووانە کە لە نەخشە بەردینەکانی سەردەمی سۆمەری، ئەکەدی یان بابلییەکاندا کراون، ناتوانریّ سنووری جوگرافیایی سەرزەمینی گۆتۆ بەرێکوپێکی دەستنیشان بکریّ. هۆی ئەمەش لەوەدایە کە ولاّتە دراوسێکانی گۆتۆ زۆر جار ناوی نوێیان لەو چیایانە ناوە کە پادشا سۆمەرییەکان بەر لەوان بەولاّتی گۆتۆیان دادەنان. دەتوانین بلّێین کەوا پادشا بەناوبانگەکانی ئەکەد و بابل تا نەچوونە ناو ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژهەلاّتی دیجلەوە، شارەزاییەکی ئەوتۆیان دەربارەی جوگرافیای سەرزەمینەکەوە پەیدا نەکرد. ئێستاش باش ئەزانین پەیوەندی سەرزەمینەکانی مەرخاشی، کاشی، لۆلۆبی و زاموا لەگەلّ سەرزەمینی گۆتۆدا چی بووە. ئاشکرایە مەسەلەکە یەکجار چڕ و تێکەلّە و لەم قۆناغەی ئێستادا لێک جیاکردنەوە و لە هێلّەگ دانیان کاری کردەنی نییە. ئەم کەم زانیارییەی پادشایەتییە کۆنەکان، لە نەخشێکی بەردینەی شاروکین (سەرگۆن)ی یەکەم پادشا و دامەزرێنەری پادشایەتی ئەکەد (ئەگادە - دەوروبەری ٢٠٥٠ پ. ز) دەردەکەویّ. لەم یەکەم هەولّەدا بۆ کێشانی نەخشەی جیهان (بەگوێرەی تێگەیشتنی شاروکین) دەردەکەویّ کە زانیارییەکی ئەو لە بارەی پانایی گەلیّ ولاّتەوە کە باسی کردوون ئەوەندە ڕاست و ڕێکوپێک نەبن. بۆ نموونە پانایی ئەکەدی ولاّتی خۆی بە(١٨٠) دوو سەعاتی دادەنیّ. ئەمەش گەلێک لە ڕاستییەوە دوورە. شارۆکین درێژایی گەلیّ ڕێگای (واتە درێژایی جوغرافیایی) لەو ولاّتانەدا کە گوایە گرتوونی نیشان داوە و بەم جۆرەی خوارەوەی داینراون:

١- سەرزەمینی مارخاشی (میدیای ڕۆژئاوا) - (٤٠) دوو سەعاتی، واتە نزیکەی (٤٢٥) کیلۆمەتر.

٢- سەرزەمینی توکریش - (٥٠) دوو سەعاتی، واتە نزیکەی (٦٤٠) کیلۆمەتر.

٣- سەرزەمینی نیلام - (٩٠) دوو سەعاتی، واتە نزیکەی (٩٦٠) کیلۆمەتر.

٤- سەرزەمینی ئەکەد - ( ١٨٠ ) دوو سەعاتی، واتە نزیکەی ( ١٩٢٠ ) کیلۆمەتر.

٥- سەرزەمینی سوبارتو - ( ١٢٠ ) دوو سەعاتی، واتە نزیکەی ( ١٢٨٠ ) کیلۆمەتر.

٦- سەرزەمینی ئاشسی (ئاشوورستان) - ( ١٢٠ ) دوو سەعاتی، واتە نزیکەی ( ١٢٨٠ ) کیلۆمەتر.

دەبلیو. ف. ئەلبرایت کە لە گۆڤاری کۆمەڵەی ڕۆژهەلاتناسی ئەمەریکادا - ژمارە (١٤) ل ٣٣٥ - ئەم سەرزەمینە بەخالسی ناو دەبا ئەگەر وا بێ، دەبێ پادشایەتی ئەکەد بریتی بووبێ لە سەرزەمینی ئاشوورستانی دوای ئەوە...

٧- سەرزەمینی لۆلۆبی - تورکی؟ - ( ٩٠ ) دوو سەعاتی، واتە نزیکەی ( ٩٦٠ ) کیلۆمەتر.

٨- سەرزەمینی ئەنزان - ( ٩٠ ) دوو سەعاتی، واتە نزیکەی ( ٩٦٠ ) کیلۆمەتر.

ئەوەی شایانی سەرنجە ناوی سەرزەمینی گۆتۆ لە لیستەی ئەم ولاتانەدا دەرناکەوێ کە شارۆکین بەگرنگترین پادشایەتی سەردەمی خۆی دایان دەنێ وێ دەچێ یەکێک لە ناوەکان هی گۆتۆ بن. لەوانەشە مەبەستی لە ئاشوورستان یان لۆلۆبی - تورکی سەرزەمینی گۆتۆ بێ. ناوی گۆتۆ هەروەها، لە نەخشە بەردینەکەی پادشا نرامسینی ئەکەدیشا هەر نایەت، کە پاش شارۆکین بەسێ پشت هاتووە. نرامسین باسی هەڵمەتی خۆی بۆ سەر گەلە کۆمەکییەکی حەڤدە پادشانشینە دەکات کە لە نۆکەندی عەرەبەوە تا ئەرمەنستان و سەرزەمینی حیثیەکانیان لە ئاسیای بچووکی ناوەڕاستدا گرتۆتەوە کەچی هیچ باسی گۆتۆ ناکات.

ج- هەندێ هەڵەی نەخشە بەردینەکان دەربارەی کورد، کۆرتی، کورتی:

وابزانم ئێرە باشترین جێیە بۆ ئەوەی هەڵەیەکێ یەکێ لە نەخشە بەردینەکان ڕاست بکەینەوە کە شێواوییەکی زۆری خستۆتە ناو وێنەکاری

دابەشبوونی نەژادی (ڕەگەزی) ئەم سەردەمەی ئاشوورەوە. لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، سێر هێنری ڕۆلینسن شارەزا و خوێنەرەوەی نەخشە بەردینەکان، پێنج جزمی لەو نەخشە بەردینانە بڵاو کردەوە کە لە چەندین شوێنەواری کۆنی ئاشوورییەکان دۆزرابوونەوە دوای ئەو لەسەر هەمان ڕێباز خوێنەرەوەکان تا چەند ساڵی تر چەند نیشانەی سەر بەردی نەخشراویان هەر بەهەڵە خوێندەوە. لەم خوێندنەوانەدا نیشانەی وەکو کورتی (کورتی) یان (کۆرتی) ناوی ئەو سەرزەمینەی دەگرتەوە کە زۆربەی ئەرمەنستانی پێک دەهێنا. وێکچوونی زەقی ئەم ناوە بەهەڵە خوێندراوەیە لەگەڵ (کورد)دا، وا دەردەکەوێ بووە پاڵپشت بۆ هەموو ئەوانەی کە لە لایەکی ترەوە ناوی ناوچەی گۆلی «وان» یان بە«گورتی» ناو دەبرد. ئێ فوررێر، هەڵەکەی ساڵی ١٩٢٨ ڕاست کردەوە[1] و ئەو هەمان کۆمەڵە نیشانەی بە خاب - خی (خابخی) خوێندەوە و ئەم بەڕاستی خوێندنەوەیەش مەسەلەیەکی گرنگی چارەسەر کرد کە گەر وا نەبووایە لە مێژووی ئەدەبی مێژوویی کۆنی ئەرمەنییدا هەر بەچارەسەر نەکراوی دەمایەوە. هەندێ ئاشووری ناسی مەزنی وەکو ئی. ف. فایدنەر، سەیدمان و دوا بەدوای ئەوان أ. گویتزە - لە گۆڤاری لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیک - دا ئەم ڕاستکردنەوەیەیان لەو ساڵەوە دووپات کردۆتەوە و بەڕاستییان داناوە و بەو جۆرە بەتەواوی ئەو ئاڵۆزییە جوگرافیاییەیان لەناوبرد کە لێوەی بەرپا بووبوو.

د- پادشاکانی گۆتۆ کە حوکمڕانیی سەرزەمینی ئەکەد و بابلیان کردووە:
بەلێکدان و کۆکردنەوەی چەند نەخشە بەردینە، ناوی بیست پادشای گۆتۆمان دێتە دەست کە حوکمڕانیی هەردوو سەرزەمینی ئەکەد و بابلیان کردووە. هەندێ لە ناوەکان بەتەواوەتی ونن و هەندێکیان تەنها بەشێکیان لێ دیارە[2].

---

1- E. Forrer: Reallexicon der Assyriologie vol. 1 (1928) pp. 255 - 281 - 328.

2- Cambridge Ancient History Vol. (1923) p. 670 No - 67-

ئەم ناوانە هەموو لە مێژوودا باس کراون، وەکو ئیمبیا، ئینگۆلیشو، وارلاگابا، لارلاگاش، ئەرلاگان، تیریکان...

لاسیراب، کە یەکێکی تر بووە لەم پادشا گۆتۆبییانەی بابل و، خاوەنی ناو و ناوبانگێکی تایبەتی بووە سەر سەوڵەجانێکی لە بەردی لووس دروستکراوی بۆ پەرستشگای شاری سیپاری بابلی تەرخان کردووە. چونکە گۆتۆکان نووسینی تایبەتی خۆیان نەبووە، لاسیراب شێوەی ئەکەدی بۆ نووسینی سەر سەرە سەوڵەجانەکە بەکارهێناوە و تێیدا یەکە یەکە ناوی خواوەندەکانی سەرزەمینی گۆتۆی نووسیوە هەروەها ناوی خواوەندە - ژنی سۆمەری، ئینفینی کە لەم دواییەدا بەنانا یان ئەناهیتا ناودەبرێ و سینیی مانگە - خواوەندیشی هێناوە.

هـ- کاشییەکان: ناوی پادشاکانی کاشی، وەکو گانداشی، ئاگووم، کاشتیلیاش، خاربە - شیباک، کاداشمان - خاربە... هتد، وەکو پادشاکانی گۆتۆ، جیاوازن و لە ناوی پادشاکانی هیچ گەلێکی تر ناچن بەسۆمەری و ئەکەدیەکانیشەوە. لە سەردەمانێکی یەکجار کۆنەوە ئەم کاشیانە لە سەرزەمینی بابل نیشتەجێ بوونە و بەبازرگانی یان پیشەوەریەوە خەریک بوونە یەکەم پشتی بنەماڵەی پادشایەتی بابل، نەک تەنها کاشییە سەر ڕەقەکانی دانیشتووی هەڵەتەکانی ڕۆژهەڵات، بەڵکو سۆمەرییە تازە سەر هەڵدەرەکانیشیان بوو بەڕیشەوە کە لە باشوورەوە خەریک بوون دەهاتن. وەکو دەردەکەوێ حیثیەکان کە لە ئاسیای بچووکەوە بەدەم ڕووباری فوراتدا لە سەدەی حەڤدەیەمدا (پ. ز) هاتنە خوارەوە یارمەتی کاشییەکانیان داوە بۆ تەفروتوناکردنی دوا ئاسەواری بابلییەکان.

و- هەندێ شوێنەواری ناو نووسینەکەی توکولتی - نینورتای یەکەم:

أ- وا دەردەکەوێ چیاکانی تول - سینا ناوچەی ئەردەڵانی ئیمڕۆی ئێران دەگرێتەوە کە بەرۆژهەڵاتی سەرزەمینی گۆتۆوە لکاوە و شاری سەننە (سنە)ی ئێستا پایتەختی بووە. لە سەردەمانی زۆر دێرینەوە، هەندێ بنەماڵە و هۆزی بەهێز و توانای کورد لە ناوچەی ئەردەڵان ژیاون.

ب- وێ دەچێ شاری ساسیلی، یان شاسیلی، شاری چەمچەماڵی ئێستا بێ کە نزیکەی حەفتا میل لە ژووررووی بەغداوەیە و دەکەوێتە سەر شارێی نێوان ئەرابخا - کەرکووک و سلێمانی.

ج- سەرزەمینی زوکوشکی کە ناوەکەی زۆر لە زاکراسەوە نزیکە، واتە ئەو زنجیرە چیایەی لە باشووری ڕۆژئاوای ئێرانەوە بەرەو تۆرۆسی ئەرمەنستان دەکشێ.

د- ئایا دەبێ لالا - ئەو چیایە نەبێ کە لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا گولاری پێ دەوترا و ئێستاش چیای کۆلارەی پێ دەوترێ کە سنووری نێوان دەشتەکانی پشدەر و ڕانیە پێک دێنێ؟. باسی ڕاستی و ناڕاستی ئەم بۆچوونە لێرەدا جێگەی نابێتەوە...

لەو تۆمارانەدا کە لەسەر خشتە بەردینەکانی سەردەمی پادشاکانی ئەم دواییەی ئاشوورییەکاندا هەڵکەنراون و تێیاندا باسی ئەو شەڕانە کراوە کە لەگەڵ هۆزەکانی گۆتۆ یان کاشوودا کراون، باسی هەندێ شوێن و مەڵبەند کراوە کە دەتوانرێ لەگەڵ ئاوایی یان شار و شارۆچکەکانی ئەمڕۆی کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە، بەیەک دابنرێت. هەروەکو ئەو چەند نموونە کەمەی کە لە سەرەوە باس کراون.

ز- هەندێ ناوی ئاشووری کە لەگەڵ ناوەکانی سەرزەمینی گۆتۆدا پەیوەندیدارن: ناوی شوێنەوارە کوردنشینەکان لە تۆماری چەندین سەدەی دوا بەدوای یەکدا بەدەگمەن دەردەکەون. لەجیاتی پادشا ئاشوورییەکان باسی سەرزەمینی لۆلۆبی، زاموا، نامری، زیری و هی تر دەکەن، کە هەموو لە نەخشەدا سەرزەمینی دێرینی گۆتۆ دەگرنەوە. شوێنی ئێستاکەی ئەم جێگایانە تەنها مەگەر دەوروبەرگیری بکرێن ئەگینا دەقاودەق دەستنیشان ناکرێن.

ح- دەربەندی بابیت: مەبەست لە دەربەندی بابیت دەربەندی بازیانە و هەر ئەویش دەگرێتەوە واتە ئەو چیا و دەشتەی دەکەونە ژووررووی باکوری

ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە[١]. لەم ناوچەیەدا ئێستا هۆزی هەمەوەند و جافی دراوسێیان نیشتەجێن. ناوی نورئەداد وێ دەچی (نوردەین)ی[٢] ئێستا بگرێتەوە کە هەم لای کورد و هەم لای عەرەبەکان ناوێکی بەڕێز و پایە بڵندە. لەم سەردەمانەی دواییدا هەمەوەندەکان چەندین جار لەشکری تورکیان شکاندووە و قڕانیان تێ خستووە. وا دەردەکەوێ ئەمان نەوەی ڕاستەقینەی ئەو باو و باپیرانەیان بن کە لە سەردەمی ئاشوور ناسرپاڵی دووەمدا ژیاون (٨٨٥ - ٨٨٩ پ. ز).

ط- کورد و ماد: هیرۆدۆتسی مێژوونووسی یۆنانی، خزمەتێکی زۆری بەزانیاری دەربارەی ڕۆژهەڵاتی دێرین کردووە. لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێ لە زانیارییەکانی شێواو و دووپاتکردنەوەی هەڵەی پێشووترن.

ئەوەتا ئەویش هاتووە و کەوتۆتە سەر باسی ئەوەی گوایە ڕەگەزێک بەناوی «ماد» و ئیمپراتۆریەتێک بەناوی «ئیمپراتۆریەتی ماد»ەوە هەبووە ئەمە خۆی لە خۆیدا شێواندنێکی تەواوی ڕاستی مێژووییە وەکو تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییەش بەڕوونی دەریان خست، بەڵام ئۆباڵی ئەوەی کە هەموو ناوەڕاستی ئێران لە ڕووی ڕەگەزەوە کەوتۆتە بەر تاریکایی شێوان و تێ نەگەیشتن و بەهەڵە چوون هەر ناکەوێتە ئەستۆی هیرۆدۆتس چونکە وەکو دەردەکەوێ هەڵەکە گەلێ لەو سەردەمەی ئەو کۆنترە و دەچێتەوە سەردەمی بابلییەکان تەنانەت ئەمڕۆش واتە لەم سەردەمەی ئێستامانیشدا، هۆزە کوردەکان بەگشتی بەنەوە و وەچەی «ماد»ەکان دادەنرێن ئەو گەلە ئەفسانەییەی کە چ یۆنانییەکان، چ تەورات بێ هیچ بەڵگە و بناغەیەک «ئیمپراتۆریەتێکی گەورە»یان لێ دروست کردوون.

---

(١) دەربەندی بازیان دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری سلێمانییەوە. - وەرگێڕ -.

(٢) هیچ پەیوەندییەک لە نێوان نورئەداد و نوردەیندا نییە، چونکە (نورالدین) ناوێکی دانراوی پاش ئایینی ئیسلامە و فری بەو سەردەمەوە نییە کە لێرەدا باس کراوە. (نورالدین) واتە (ڕووناکی ئایین). - وەرگێڕ -.

زانیاریی تازە و ورد کە لە ئاسەواری چەند میللەتەوە وەدەست هاتوون، هەروەها چەندین خشتە بەردینەی کۆنیش دووپاتی دەکەنەوە، ئەوە دەردەخەن کە هەرگیز گەلێک نەبووە لە مێژوودا ناوی «ماد» بووبێت و، ئەوەی لەم بارەیەوە بەردەوام دەجووڕێتەوە، لە بوختان و قسەی بێ پایە و بنەما، بەولاوە هیچی تر نییە، چونکە میدیای ئەفسانەیی، بەو شێوەیەی کە نووسەرە کلاسیکییە یۆنانییەکان باسیان کردووە، تەمومژێکی یەکجار چڕ دەخاتە سەر مێژووی چ ئەرمەنستان و چ هی گەلی کورد و من ئەم مەسەلەیە بەکورتی، وەکو پێشەکییەک، لە مێژووی ئەرمەنستاندا یەکالا دەکەمەوە. هەندێ دەقی زمانەوانی سۆمەری کە پرۆفیسۆر ئی. شێترا بلاوی کردۆتەوە و ئۆگناد وەریگێڕاون (أ. ئۆگناد: سوپارتو، ل ٤٥) بەڕوونی ئەوە دەردەخەن کە سۆمەرییەکان وشەی «مادا»یان لە بنەڕەتەوە لەجیاتی «سەرزەمین» یان «وڵات» بەکارهێناوە، وەکو «مادا گۆتیەم» واتە «سەرزەمینی گۆتۆ» و «مادا ئیلامێن» واتە «سەرزەمینی ئیلام» بابلییەکان کە پاش چەندین سەدە هەر لەسەر ڕێبازی ئەدەبیات و زمانەوانیی سۆمەرییەکان ڕۆیشتن، مانای ئەسڵیی وشەکەیان فەرامۆش کرد و بەهەڵە وایان دانا کە گوایە ناوی سەرزەمین یان گەلێکی تایبەتییە بێ ئەوەی هەرگیز بزانن ئەم سەرزەمینە کامەیە و گەلەکە کێیە؟ پاش ئەوە ئاشوورییەکان ناوەکەیان لە بابلییەکانەوە وەرگرت ئینجا فارس و یۆنانییەکان لە ئاشوورییەکانەوە و نووسەرە ئەوروپاییە کلاسیکییەکان لە یۆنانییەکانەوە. ئەوەی ڕاست بێ، چەند «مادا» لە ئێرانی ناوەڕاستدا هەبووە، بەڵام وەکو دەردەکەوێ، هەرگیز سەرزەمینێک نەبووە کە ناوی «میدیا» بووبێ.

شارەکانی هەمەدان «ئەکباتانا»، سوڵتاناباد، قەزوین، ڕاگی و چەند شاری تری ناوەڕاست و باکوری ئێران و ڕۆژئاوای بیابانی خوێ، هەمیشە لە لایەن بنەماڵە یان خانی خۆولاتییەوە فەرمانڕەوایی کراون. بەڵگەی تەواو بەدەستەوەیە کەوا هەمان بارودۆخ لە سەردەمی سۆمەری و

ئەکەدیەکانیشدا هەر باو بووە. هەر لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەرگیز نە گەلێک بەناوی «میدی»یەوە هەبووە نە سەرزەمینێک بەناوی «میدیا»وە و ئەمڕۆش هیچ ئاسەوار و بەڵگەیەک لە ئارادا نییە کە پێچەوانەی ئەمە بێ و بەرپەرچی بداتەوە.

پادشا مەزنەکانی ئاشوور، وەکو شەلمانەسەری سێیەم (٨٥٨ - ٨٢٤ پ. ز)، تیگلات پلاسەری سێیەم (٧٤٧ - ٧٢٧ پ. ز) و سارۆکینی دووەم (٧٢٢ - ٧٠٥ پ. ز) باسی ئەوە دەکەن کە چەند جار «مادا»یان داگیر کردووە و ناوی چەندین شوێنەوار دێنن کە ئێستا دەکەونە ئەو ناوچانەی ئێرانەوە کە لە سەرەوە باسمان کردن ئاشکراشە کە مەبەستیان لە «مادا»کان هەر ئەو شوێنەوارانە خۆیانن. نەک هەر ئەمە، لە چەند جێگا باسی بەزاندن و باج و خەراج ستاندن لە «مادا»کان دەکەن بێ ئەوەی بزانن کە ئەو شوێن و جێگایانەی باسیان دەکەن هەمان «مادا» واتە «سەرزەمین»ن. کە شەڕەکانیانی لەسەر دەکرا ئەو خێڵە ڕەوەندانەی کە لە زۆر جێگادا بەناوی ئومان ماندا هاتوون (ئایا ئەمە بەرامبەرێکی تری مادا نییە؟) کە لە ساڵی ٦٠٦ پ. زدا لە ڕووخاندنی ئاشوورییەکاندا یارمەتی بابلیان دا، هەمان هۆزەکانی ئێرانی ناوەڕاست بوون و هەرگیز فریان بەو ئێرانەوە نەبوو کە لە نووسراوە کلاسیکییەکانی یۆنانییەکاندا باس کراوە، لە کاتێکدا ئاشوور پانیپاڵی پادشای ئاشوور (٦٨٨ - ٦٢٤ پ. ز) کە ناچار بوو دژ بەشەماشیۆمۆکینی برای کە پادشای بابل بوو، بجەنگێ گۆتۆ بەیەکێک لەو وڵاتانە دادەنێ کە دۆست و هاوپەیمانی شەماشیۆمۆکین بوونە.

ی- سەرزەمینە سنوورییەکانی ئێران: لە لیستەی سەرزەمینە سنوورییەکانی ئێراندا، هیرۆدۆتس ئەرمەنستان و ئەو گەلانەی دەوروبەری دەریای یوکسین لەگەڵ پاکتسیدا، کە لە ڕاستیدا سەرزەمینی بابخی کۆن و بۆهتانی ئەمڕۆ دەگرێتەوە، تێکەڵ دەکا. لەم بابخی - بوهتانە کۆمەڵە هۆزی ئەو هۆزە کوردانە دروست بوو کە بەهەفتا نبوخت و چاربوختی

بەناوبانگن؛ هەروەها ناوی «بەهدینان»یش کە نازانرێ لە چییەوە دروست بووە پەیوەندی بەمانەوە هەیە. وا دەردەکەوێ، ئەم هۆزانە لە بنەڕەتەوە لەو هەرێمەدا ژیابن کە دەکەوێتە نێوان هەردوو زێ و ڕۆژهەڵاتی دیجلە (بوهتان سو)ەوە. تا ئێستاش لە هەمان سەرزەمیندا بەناوی خێڵایەتی جۆراوجۆرەوە دەژین. بەڵام هەروەکو لە سەرەوە باسمان کرد (ف ٤) لەگەڵ هاتنی تورکەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەیەمدا ئەم هۆزانە هان دران بەلێواری زنجیرە چیاکانی تۆرۆسدا بەرەو ئەرمەنستان و سوریا کۆچ بکەن.

ک- ساگارتیەکان: لەو نووسراوانەدا کە لەسەر تاشە بەردەکانی کێوی بێستوون هەڵکەنراون، دارا ساگارتیەکان بە«ئەساگارتا» ناو دەبا بەردە نەخشینە کۆنەکانی ئەرمەنییەکان و ئۆرارتییەکان لە زۆر جێگادا بەهاوپەیمانی پادشاکانی ئۆرارتو باسیان دەکەن. نووسەرە کلاسیکییە ئەرمەنییە کۆنەکان باسی شێوەی بەکارهێنانی جۆراوجۆری کەمەند دەکەن، کە ئەمان لە شەڕی خێڵەکانی ناو زنجیرە چیاکانی قەفقاسدا بەکاریان هێناوە. ئەو قسەیە هەرگیز ڕاست نییە کە دەڵێ گوایە گارتی - شکاکەکان بەزمانی فارسی دواون. بەپێچەوانەوە ئەمڕۆ، دڵنیام کە لە سەردەمانی پێشووشدا هەر وا بووە، ئەوان بەشێوەی پاک و پاراوی کرمانجی دەدوێن کە لەوانەیە کۆنە زمانی سەرزەمینی گۆتۆ بووبێ، هەر لەبەر ئەم هۆیەش نزیکەی دوو هەزار ساڵ لە فارسەکان کۆنترن.

ل- ئەو سەرۆک خێڵانەی کە لە کۆشکی پادشای ئەرمەنستاندا خاوەن جێگا بوون، نزیکەی پێنج سەرۆک هۆزی (وەکو میری ئەکە - کە هۆزی هەژانانی یەزیدی ئێستای هەکاری و میری ئەشاخامار، کە هۆزی یەزدانشێری سەدەکانی ناوەڕاست دەگرێتەوە) لە کۆشکی شاهانەی ئەرمەنستاندا خاوەن «تەخت» یان «دۆشەک»ی تایبەتی بوون کە لەگەڵ پایەبەرزترین میری فیودالی ئەو سەردەمەدا چ جیاوازییەکیان نەبووە. لە پاڵ وشەی «کوردۆخ»دا زانا و مێژووناسە کلاسیکییە ئەرمەنییەکان باسی

«ماد»ەکان و «مید»یەکانیش دەکەن. ئەم ناوانە گیروگرفتی یەکجار ئاڵۆزی جوگرافیایی و ڕەگەزی دێننە ئاراوە کە لەم کتێبەدا بەباشی و پڕ بەپێست جێگای باس و تاوتوێکردنیان نابێتەوە.

**فەسڵی سێیەم:**

أ- ئەو دەرەبەگە کوردانەی کە خۆیان دایە پاڵ عوسمانلییەکان و پشتگیریان کردن بریتی بوون لە: شەرەف بەگی بتلیسی، مەلیک خەلیلی سێرت و حەسەن کێف کە ئێرانییەکانی لەم قەڵا و قەڵایچانە دەرپەڕاند. محەمەد بەگی ساسۆن، نەوەکانی میرنشینی مەزنی بەدرخانییەکان لە جزیرە، بەرەبابە و بەپشتاوپشت بەمیری هاتووەکانی هەولێر و سلێمانی (کە هەموو پێکەوە میرنشینی بابان پێک دێن و پاشماوەی پادشایەتی دێرینەی شارەزوورن).

پاش ئەوەی دەوڵەت ملی بۆ مەرجەکانیان دا. هەروەها بەگی دیاربەکر و جەمشید بەگی مەقدیسی، کە بەبنەچە ئەرمەنی بوو و ئەوسا سەرداری پالو بوو.

ب- حکوومەتەکان: لە بنەڕەتدا، ئەو نۆ حکوومەتەی لە لایەن سەرۆک خێڵەکانەوە سەرۆکایەتی دەکران بریتی بوون لە حکوومەتەکانی هەولێر، کەرکووک، سلێمانی، حەسەن کێف، جزیرەی ئیبنی عومەر، هەکاری، ساسۆن، ئامێدی و بتلیس. بەڵام لەبەر ئەوەی لەو دوو سەدەیەی دواییدا (١٥١٦ - ١٧٣٠) شاری بەغدا و چەندین لەو سەرزەمینە کوردنشینانە زۆر جار ئەم دەست و ئەو دەستیان دەکرد لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتە دژ بەیەکەکەدا، ڕێککەوتننامە ئەسڵییەکان یان وازیان لێ هێنراوە یان پشتگوێ خراون. ئەو کۆمەڵە هۆزیەی کە مایەوە یەزیدییەکانی سنجار، میهرانی (ملی)یەکانی دیاربەکر، نسیبییەکان، هۆزەکانی ئەرغەنی - مەعدەن و زازاکانی دەرسیم، پایەی بەگی سەنجەقیان درایە و هەمان مافی حوکمفەرمایی خۆ بەخۆیان وەکو پێشوو پێ درا و ناونران «اکراد حکومتی» حکوومەتی کوردان.

ج- ئۆتۆنۆمی لە سەردەمی سوڵتان محەمەدی فاتیحدا: هەر دوا بەدوای گرتنی ئەستەمبووڵ لە ساڵی ١٤٥١دا، سوڵتان محەمەدی فاتیح جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی مەدەنی و ئایینی بەرفراوانی بەیۆنانی و ئەرمەنییەکان دا. پەترەکەکانی ئەم گەلانە تەنانەت مافی دادانی حوکمی مەرگیشیان بەسەر تاوانبارەکانی میللەتەکانی خۆیاندا پێ درا بوو.

د- وشەی عەجەم لە کوێوە هاتووە؟: وام بۆ دەردەکەوێ کە وشەی عەجەم لە وشەی ئەکامەنیش یان هەکامەنیشەوە وەرگیراوە؛ کە ناوی یەکێکە لە سەرۆکەکانی بنەماڵەی هەخامەنشیی ئێران. لە نووسراوەکانی سەر تاشە بەردەکانی چیای بێستووندا، دارای مەزن (٥٢١ - ٨٤٥ پ. ز) دەڵێ هەشت پشتی بەر لە خۆی هەر پادشا و پادشازادە بوونە و یەکەمیان و لە هەموویان ناودارتر ئەکامەنیش بووە.

هـ- ئەوروپاییەکان باسی ڕۆژئاوای ئێران و تورکیایان لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا چۆن کردووە:

ناوی مێژوویی شوێنەکان و ناوە ڕەسەن و دێرینەکانی خێزان و بنەماڵەکان چەند جار بەئامانجی سڕینەوەیان لە مێشکی خەڵکدا، کەوتنە بەر گێژاوی گۆڕین و هەندێ جاریش چونکە تۆمارگە و فەرمانبەرەکانی تورک لە ئەستەمبووڵ ئەوەندە بەتەنگی ئەوەوە نەبوون بەرێکوپێکی یادداشت و لە تۆمارە دەوڵەتییەکاندا تۆماریان بکەن.

هەروەها، لە سەردەمی شەڕەکانی ناپلیۆندا، گەڕیدە ئینگلیز و ڕووس و فەرەنسییەکان، بەتایبەتی، دەستە دەستە بۆ ڕۆژهەڵاتی تورکیا، هەروەها بۆ ئێرانیش دەهاتن بۆ پەیداکردنی دۆست لە ناو گەلانی ئەو سەرزەمینانەدا. ئەم گەڕیدانە گەلێک بیرەوەری و یاداشتی بەنرخ بەنرخیان لە بارەی لایەنە جوگرافیاییەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە نووسیوە و بەلێکدانی ئەم زانیاریانە لەگەڵ سەرچاوە تورکییەکاندا وێنەیەکی ڕۆشنی ساڵانی (١٧٥٠ - ١٨٣٠)مان دێتە دەست (بڕوانە ف ٣ و ٤).

و- پاشایەتی بەغدا: ئەم پاشایەتییە لە نۆکەندی فارسەوە تا دەگاتە کلکە خوارینەکانی ناو ئەرمەنستانی چیای تۆرۆسی دەگرتەوە. هەندێ پاشای بەهێز و توانایان، کە بەبنەچە کولەمەند بوون، سێبەری دەسەڵاتی خۆیان تا ئەرمەنستانیش دەبرد، هەر نەبێ بۆ باج و خەراج لەشکردان (حکوومەت و سوپای کولەمەندەکان لە بەغداد لە سەرداره عەرەبەکان و هەندێ چەرکەز و گورجی و خەڵکی تری ناوچەی قەفقاسیا کە بەدوای دەوڵەمەندی و دەسکەوتدا هاتبوونە خوارەوە، پێکهاتبوو).

ز- میرنشینی سەربەخۆی بابانەکان: سەرداره مەزنەکانی بنەماڵەی بەناوبانگی بابان زۆربەی زۆری ئەو ماوەیەی کە تێیدا حوکمڕان بوون، وەکو حکوومەتێکی سەربەخۆ و بێ ژووردەست حوکمفەرماییان دەکرد. مەڵبەندی حکوومەتەکە لە شاری سلێمانی بوو. ساڵی ١٨٠٦ عەبدولڕەحمان پاشای بابان لەشکری تورکی تارومار کرد و لە دوای دوو ساڵ ململانێی نابەرابەر بەخیانەت لە ناو درا. ساڵی ١٨١٢ ئەحمەد پاشای کوڕی تا بن دیوارەکانی شاری بەغداد لەشکری تورکی هەڵبڕی.

**فەسڵی چوارەم:**

أ- دوو هاوپەیمانی گرنگی بەدرخان بەگ:

١- خان مەحموود، کە بەبارۆنی کورد و ئەرمەنییەکان بەناوبانگ بوو و حوکمفەرمایی وڵاتی مووک و ئەو ناوچانەشی دەکرد کە دەکەونە نێوان هەکاری و کەنارەکانی خوارووی گۆلی وانەوە. ئەو سەرگەورەی بنەماڵەی ئەڤداڵ خانی، یەزیدی ئایینی، بەبنەچە خەڵکی وڵاتی هەکاری بوو. ئەڤداڵ خانەکان، کە لقێکی گەورەی بنەماڵەی یەزدان شێرن، جار بەجار حوکمفەرمایی شاری وانیان بەدەستەوە بووە، پاش ئەوەی لە لایەن تەیموور لەنگەوە داگیر کراوە. خان مەحموود، بەش بەحاڵی خۆی، خاوەنی هیچ ئاوات و ئامانجێکی تایبەتی سیاسی جیا لە بەدرخان بەگ نەبوو. تا بۆی دەکرا نەیدەهێڵا هیچ سێبەر و سایەیەکی عوسمانی بەسەر وڵاتەکەیدا

سایەدار بێ لە سەردەمی ئەودا ولاتەکە لە ئیمنایەتی و خۆشییدا دەژەلایەوە. ئەفسەرێکی ئینگلیز کە چۆتە سەردانی خان مەحموود نووسیویە دەڵێ: «خان مەحموود، کەوا لەم دواییەدا دەسەلاتی بەسەر ناوچەی خەڤاسووردا کێشاوە دیارە کە پیاوێکی زۆر زەبەردەست و دەسەلاتدارە، دەسەلاتی ئیسحاق پاشای وان بەئاستەم لەو دەشتە ڕەت دەبێ کە شاری وانی لە باوەشدایە (کۆڵۆنێل جەی. شیل، هەندێ تێبینی دەربارەی گەشتێک بۆ تەورێز بەکوردستاندا بەوان و بتلیس و سێرت و هەولێر و هەندێ جێگەی ترەوە تەمووز و ئابی ساڵی ١٨٣٦، بڕوانە گۆڤاری کۆمەڵەی جوگرافیایی شاهانە جزمی هەشتەم (١٨٣٦) (ف ٤).

دوو ساڵ دوای ئەو کونسولێکی بەریتانیا سەری لە هەرێمەکەدا و بینی کەوا خان هەموو ولاتەکەی بەدەستەوەیە و خەڵکەکە لە نەختێ گرانی باجگیری بەولاوە بێزارییەکی تریان نییە. ئەوان لە سیستەمی ڕاپەڕاندن و پۆلیسی خان تا بڵێی ڕازی بوون. تاقە شتێک کە لە جاران جیاواز بوو ئەوە بوو خان بەناوە بەڵێنی گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانی سەرئەسکەری ئەرزەڕۆم دابوو و ئەمەش کارێکی تا بڵێی ژیرانە بوو.

خان سەرداری هێزەکانی لە ڕۆڵەکانی هەموو نەتەوەکانی سەرزەمینەکەی خۆی پێکهێنا بوو قەشەی ئەرمەنییەکان، سەرگەورە و پیاوماقووڵەکانی هۆزەکانی شکاک و هەرتووشی و چەند هۆزی تر، جگە لە میرەکانی وان، دۆست و هاوپەیمانی خان بوون.

٢- نوروڵلا بەگی هەکاری ڕۆڵەی ڕەسەنی ئەو بنەماڵەیەی چەندین سەدە حوکمفەرمایی ئەم ناوچەیەی سەر سنووری ئێران بوون، زانیارییەکی کەممان لە بارەیەوە بەدەستەوەیە ئەوەی لێ دەرچێ کە بەپیاوێکی یەکجار دڵڕەق و لە خوانەترس ناوبانگی دەرکردبوو و هاوکاریشی لەگەڵ بەدرخان بەگدا تا دوایی هەر جێگای گومان و باوەڕ نەکردەنی بوو.

ب- هێزەکانی سوارە کوردەکان:

هێزی سوارەی عەشایر کە لە ژێر فەرماندەی حکوومەتی تورکدا بوو، لە هۆزەکانی ناوچەی بوهتان و چیای جوودی، واتە ناوچەی مەڵبەندی میر بەدرخان پێکهێنرا بوو. هۆزە بەدەسەلاتەکانی وەکو میرانەکان، تایانەکان، باتوانەکان، دوودەریەکان، قاچان و شەرنەخەکان، نزیکەی چل بەتالیۆنیان دابوو حەیدەرانەکان، جبرانیەکان، جەلالیەکان و موگورەکان نزیکەی ٢٠ بەتالیۆنیان دابوو هێزێکی تر لە ناوچەی دیاربەکر لە ملیەکان (هۆزە بچکۆلەکانی وێرانشەهر و دەوروبەری ڕووباری خاربورد) پێکهێنرا بوو.

**فەسلی پێنجەم:**

أ- تەکیە[١]:

خێزان دۆڵێکی جوانی لێڕەواراوی ناو چیاکانی خوارووی شاری بتلیسە. دووجار سەرم لە تەکیەکەی داوە و چەند ڕۆژ میوانداریم کردووە. یەکجار خۆپارێز و بەرامبەر بەتورکەکان گومانبار بوو. مەگەر بەدەگمەن ئەگینا خۆی نەدەجوولا و نەدەچووە سەفەر گەر بچوایە مێزەرێکی زلی لەسەر دەنا بریتی بوو لە چەندین پارچەی ڕەنگاوڕەنگی شاڵ سواری ئەسپێکی ڕەسەن دەبوو و بەپارچەیەکی تەنکی شاڵ. ڕوخساری خۆی دادەپۆشی، تا لە چاو و نیگای بەد بەدوور بێ. بەچوار دەوریدا چەند سواری پڕ چەک پێشی دەکەوتن. بەم وێنەیەی سامی لە سامدار دەستاند. بەڕاستی کوردێکی زۆر لەو باوەڕەدا بوون کە ئەوەندە پیرۆز و دەم و نفوس پاکە بۆیە تەنانەت بۆی هەیە ژنەکانیشیان لە نەخۆشی و نەزۆکی و دەرد و بەلا ڕزگار کە.

---

(١) دەبێ مەبەست شێخی خیزان بێ نەک تەکیەکەی - وەرگێڕ -.

**فەسلی شەشەم:**

أ- ئەو سەرکردە کوردانەی کە لە لایەن تورکانەوە حوکمی مەرگ دران:

لەو سەرکردە کوردانەی کە حوکمی مەرگ دران، سەید عەبدولقادری ئەندامی ئەنجومەنی پیرانی عوسمانی، حەسەن خەیری بەگ و چەند ئەندامی تری پەرلەمان، شێخ سەعیدی پیرانی سەرکردەی شۆڕشەکە و چەند کەسی تر. وەکو ئەوانەی بەچاوی خۆی بینیویانە دەیگێڕینەوە. دوکتۆر فوئادی نیشتیمانپەروەری کورد لە بەردەم سێدارەکەدا هاواری کرد «من بەوپەڕی بەختیاری و شادیەوە بۆ نیشتمانی خۆم و سەربەخۆیی کوردستان دەمرم».

ب- قزلباشەکان: هۆزەکانی دەرسیم بەشێوەی زازایی کوردی دەدوێن و بەخۆیان دەڵێن «یۆل ئوشاغی - ڕۆڵەی بیروباوەڕ». لەبەر ئەوەی یان خوانەناسن، یان شیعەن یان گاور، هەریەکەیان داب و ڕەسمی ئایینی ئەویتریانی لا بەنرخ و جێی ڕێزە.

هەموو ڕۆژی هەینی بەپیرۆز دادەنێن و چ قورئان و چ ئینجیل، هەردووکیان دەزانن. وەکو زۆربەی ئەو تیرە و هۆزە کوردانەی کە لە شوێنە دووردەستەکاندا دەژین و شێخیان لە ناودا نییە، ئەوانیش جێگەی تایبەتی نوێژکردنیان نییە و جاربەجاریش بۆ زیارەت و شفاخوازی دەچن بۆ کەنشت و دێرەکانی ئەرمەنستان و سوریا. ئەم هۆزانەی دەوروبەری دەرسیم، پاشماوەی سەرنجکێشی سەردەمە هەرە دێرینەکانن و شایستەی ئەوەن چ لە ڕووی ڕەگەزەوە چ لە ڕووی مێژووی ئایینەوە بخرێنە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

# پێرست

**فەسڵی پێنجەم**



**فەسڵی شەشەم**

وەک دەردەکەوێ گوناهی گەلی کورد ئەوەیە ناتوانێ بەژێردەستەیی بژی جا ئەم ژێردەستەیییە بۆ داگیرکەر بێ یان بۆ هێزێکی سەربەخۆی حوکمڕان یان بۆ ئیمپراتۆریەتێکی دراوسێ.

ئارشاک سافراستیان




Aras Press and Publisher
Kurdistan - Erbil
2005
www.araspublisher.net
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە